# بنەماکانی
# پزیشکی دادوەری







نووسینی
دکتۆر هیوا عومەر ئەحمەد

# بنەماکانی
# پزیشکیی دادوەری

نووسینی

دکتۆر هیوا عومەر ئەحمەد

چاپی دووەم

١٩٩٩

# ناوەندی چاپەمەنی و راگەیاندنی خاک

ناوی کتێب : **بنەماکانی پزیشکیی دادوەری**

نووسینی : **دکتۆر هیوا عومەر ئەحمەد**

تایپی کۆمپیوتەر : **هێدی محەمەد**

مۆنتاژ : **بازیان جەلال**

چاپی دووەم : **سلێمانی / ١٩٩٩**

چاپ : **چاپخانەی خاک**

ژمارەی سپاردن : ( **٤٣٥** ) **ی ساڵی ١٩٩٩ ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە**

**تیراژ : ٨٠٠ دانە**

# ناوەڕۆک

# پێشەکی و چمکێکی مێژوویی

پێناسە: ئەو زانستە پزیشکییەیە، لەسەر شارەزایی پزیشکی و شیکردنەوەی وردی زانستی بەندە. لایەنی پزیشکی ئەو رووداوانە، یەك لایی ئەکاتەوە کەئەچێتە دادگاکان و بەردەم دادوەران[1].

بەپێی ئەو ئامارو بەڵگەنەویست و نیشانانەی ئەیخاتە روو، بەکۆڵەکەیەکی گرنگی خۆپاراستن و قەڵاچۆکرنی تاوان دائەنرێت.

چمکێکی مێژوویی:

گەرچی تاوان وەك چاکە، لەسپێدەی مێژووەوە هەیە، بەڵام تا دەستورەکەی (ئۆرنمۆ)، کەیەکەمین دەستوری نووسراوەی مرۆڤە، هیچ دەقێکی یاسایی نەبووە بۆ رێکخستنی تاوان.

لەبەندی (٥)ی ئەم دەستورەدا، هاتووە: ((ئەگەر پیاوێك بەزۆر سورێنی کچێکی برد، ئەبێت پێنج شیقل زیو بدات)). بێ گومان سەلماندنی ئەم تاوانە، پسپۆرێکی ئەوێت کەکچەکە بپشکنێت و بریاری (بێ بنی)یەکەی بدات، تاتاوانبارەکە سزا بدرێت.

لەبەندی (٣٣)ی یاسای (لبت عشتار)دا هاتووە کە: ((ئەگەر یەکێك ناویکچی پیاوێکی ئازادی، شوونەکردووی بەوە زڕاند، کەداوێن پیسی کردووە، بێ ئەوەی بیسەلمێنێت، ئەوا ئەبێت (ناوزڕێنەکە) دەشیقڵ زیو بدات)).

لەبەندی (١٣٠)ی دەستوری (حامورابی) دا تایبەت بە ((بەزۆرسواربوون)) و بەندی (١٥٧)یدا ئەڵێت: (داوێن پیس)ێك ئەبێت بەسووتاندن، سزابدرێت.

هەروەها بەندی (٢١٦-٢٢٣)، پەیوەندی بەکرێی دکتۆر و سزای هەڵە رەوشتی‌یە پیشەیی‌یەکانەوە هەیە. بەمە (حامورابی)، بەیەکێك لەو دەسەڵات دارانە دائەنرێت، کەهەوڵیان داوە بۆ دەست نیشان کردنی (رەوشتی پیشەی پزیشکی)! یەکەم کەس بووە پیلانی (ئەنجومەنی جڵەوگیری پیشەیی_ المجلس الانضباط المهني) ی دارێژاوە.

قورئانی پیرۆزیش، باسی بەزۆرسواربوون و داوێن پیسی و خواردنەوەی بەدوورو درێژی کردووە، کەچۆن داوێن پیسان بەبەردەباران سزابدرێن، وەك لەئایەتەکانی (٢٧-٣١) ی (سورە المائدە) و شوێنی تردا باس کراوە.

لەکۆتایی دەستەڵاتی (عوسمانی)دا، (بەیتارو دەلاك)ەکان کاری دادوەریی پزیشکییان کردووە. لە(بەغداد) ەوە پزیشك ئەنێردرا بۆ لێکۆڵینەوە لەکارەسات و مردنی گەورە لێپرسراوان.

لەگەڵ کردنەوەی نەخۆشخانەی (المجیدیە) لەبەغداد، بەشی (پزیشکیی دادوەری) تیاکرایەوە، پاشان لەنەخۆشخانە نوێکانی "شایانە" ، (کۆماری) کەئێستا (شاری پزیشکی- مدینە الطب) ە کرایەوە.

(الدلیل في مسالك الطب القانوني ـ ١٩٢٥)، یەکەم دانراوە کەعێراقی‌یەك کەدکتۆر (حنا خیاط)ە داینابێت. دکتۆر (احمدعزەالقیسي)، هەڵگری یەکەم بڕوانامەبوو لەم بوارەدا، لەساڵی (١٩٣٢)دا گەڕایەوە (عێراق).

وردەوردە ئەم زانستە گەشەی کردو (ئامۆژگای پزیشکیی دادوەری) سەربەشالیارگای تەندروستی و بەشی پزیشکیی دادوەری لە زانکۆی بەغداد کرایەوە.

لەئەمەریکا؛ پزیشکی دادوەر، تەنیا مامەڵە لەگەڵ لاشەدا ئەکات، لە ئینگلتەرە، دووپسپۆری هەیە، یەکەمیان مامەڵە لەگەڵ

کێشـەی زیندووان و دووەمیـان مامەڵـە لەگـەڵ لاشـەی مـردوو دـ.
ئەکات، لەسکۆتلەندە و عێراق پزیشکی دادوەر بەهەدوو کارەکە هەڵئەسێت.

لەکوردستان دا، پزیشکیی دادوەری، وەك جێگاو و دامەزراو هەیەو رۆژانە نەشتەرگەران، کارەکەی رائەپەڕێنن. تانووسینی ئەم کتێبـە لەکوردسـتان دا پزیشـکی دادوەر نی‌یـە و هیواداریـن بەهەوڵی دڵسۆزان چەند دکتۆرێك بنێردرێت بۆ مەشق و پسپۆری لەم بوارەدا. وەك وتمان تائێستاش هەرنەشـتەرگەرە بـەڕێزەکان، بەهـەموو کێشـەیەکی پزیشـکی دادوەری هەڵئەسـن، چ کێشـەی زیندوو، مردوو، هەڵدانەوەی گۆڕ...هتد.

دکتۆرەکانی نەخۆشی ژنانەوزایین، بێ ماندووبوون لەم بوارەدا هاوکاری نەشتەرگەران بون، لەکێشەی ئەو تاوانەسێکسی‌یانەدا، کەلایەنێکی مێینە بووبێت.

کارمـەندی پزیشـکیی دادوەری: هـەموو ئـەو کارمـەندو شـارەزایانە ئەگرێتـەوە کـەڕاوێژیان پـێ بکرێـت، یـان لەیـەك لاکردنەوەی کێشەکانی ئەم بوارەدا بەشداری ئەکەن، وەك دکتۆر، شـارەزای چـەك، پسـپۆری پەنجەمۆرناسـی و وێنـەگرو دادوەر و پۆلیس.

پزیشـکی دادوەر: هـەر دکتۆرێـك، (مـەرج نی‌یـە پسـپۆربێت، لەهەر بەشێکی پزیشکی‌دا کاربکـات)، راوێـژی پـێ بکرێـت یـان لەشیکردنەوەی ئـەم کێشـانەدا بەشـداربێت، بەپزیشـکی دادوەر دائەنرێت.

لێرەدا ئەبێت ئەوە بڵێین کـەهیچ دکتۆرێـك بـۆی نی‌یـە ببێتـە پزیشـکیی دادوەری نەخۆشـەکانی خـۆی. پزیشـکی دادوەر ئەبێت:ـ

١ـ ئازاو چاونەترس، بێفیز، نهێن گرو دەستو دەمو داوێن پاك بێت. نابێت بەهیچ جۆرێك، هیچ شتێك، بۆهیچ کەسێك بدرکێنێت، ئەبێت بێلایەن، بەئاگا، لەکارەکەی‌دا وردوشارەزا بێت. توانای قۆزتنەوەی شتی بچوکی هەبێت، بەهیچ شێوەیەك، لەهیچ بارودۆخێك دا، دەستپاکی زانستی خۆی نەدۆڕێنێت.

٢ـ شارەزای لایەنی یاسایی ئەو بابەتانە بێت، کەپەیوەندی بەم جۆرە کێشانەوە هەیە. هەمیشە هەوڵ بدات، خۆی بەخوێندنەوەو بەدوارۆیشتنی زانیاری نوێ دەوڵەمەند بکات.

٣ـ لەدەرەنجام و بۆچوونەکانی‌دا، پشت بەبەڵگەی پتەوی مادی ببەستێت.

٤ـ گەرکێشەیەکی بۆ یەکالا نەکرایەوە، راوێژ بەپسپۆرانی جیاجیا بکات، یان کێشەکە بەلیژنەیەك بسپێرێت.

٥ـ دەربڕینی دەرەنجامەکانی ئاسانو ساکاربێت، تاهەموو کارمەندێکی پەیوەندیدار، بەئاسانی لێی تێبگا. نوسینەکانی بە زمانێکی ساکارو پاراو بنووسێت، بەجۆرێك لەدادگاکان دا بە ئاسانی لێی تێبگەن.

پەیرەوی پشکنین:

یەکەم ـ بریندار: بەنووسراوێکی پۆلیس ئەنێردرێت بۆ بەشی فریاکەوتنی نەخۆشخانە؛ راپۆرتی سەرەتایی پزیشکی‌ی دادوەری (التقرير الطبي العدلي الاولي) و وەڵامەکەی ئەگەرێنرێتەوەبۆ ئەو مەڵبەندی پۆلیسەی بریندارەکەی ناردووە. ئەگەر برینداریك بێ ئەم نووسینی پۆلیسە گەیشتە نەخۆشخانە، ئەبێت هەموو فریاگوزاری‌یەکی بۆ بکرێت و لەمەترسی رزگار بکرێت. بەڵام هاوکات داوا لەیاوەرەکەی یان کەسوکارەکەی ئەکرێت، بچن لەمەڵبەندی پۆلیس (کەزۆرجار لەناونەخۆشخانەکەدایە) نووسراوێك بهێنن.

دووەم ـ کێشەکانی تر:

١ـ ئەبێت پۆلیسێك لەگەڵ نێردراوەکەدا بێت، کەنووسراوی تایبەتی مەڵبەندی پۆلیسی پێ بێت. بەئاشکرایی ژمارە، بەروار و وێنەیەکی نێردراوەکەی لەسەر بێت و مۆری مەڵبەندەکە لەوێنەکە درابێت.

ئەبێت مەچەکی نێردراوەکە بەهەمان مۆر، مۆرکرابێت و دوو وێنەی خۆی پێ بێت. تالەکاتی وەڵام دانەوەدا وێنەکان بدرێن لەنووسراوی وەڵام دانەوەکە. ئەبێت بەئاشکرایی کورتەیەکی رووداوەکەی تیا بێت و بەروونی دیاری کرابێت کەچ جۆرە (پشکنین)ێکیان ئەوێت.

٢ـ ئەبێت جێگایەکی تایبەت لەدەزگا تەندروستی‌یەکان دا تەرخان بکرێت بۆئەم جۆرە پشکنینانە، تانێردراوەکە نەتوانێت رابکات، یان پەیوەندی بەخەڵکی‌یەوە بکات. ئەبێت (یەخچاڵ ـ الثلاجة)ی لێ بێت بۆپاراستنی ئەو نموونانەی (نماذج)، کەبۆپشکنینی تاقیگایی وەرئەگیرێت. جگە لەم پێویستیانەی خوارەوە؛

- سەرچاوەی رووناکی چاك
- مێز و کورسی
- مێزی پاڵ کەوتن
- شوشەو سلاید
- چیلکەو لۆکە
- چەقۆ، دەرزی، سرنج...هتد

٣ـ ئەبێت پزیشکەکە کات و سات و بەرواری گەیشتنی نێردراوەکە تۆمار بکات.

٤ـ ئەبێت پزیشکەکە چەشن و پەیرەوی پشکنینەکە لەنێردراوەکە بگەیەنێت.

٥- ئەبێت پەرستار (ممرضة)یـێـك بـۆ (بەردەسـتی) پشـكنینی مێینە، برینپێچێك بۆ پشكنینی نێرینە تەرخان بكرێت. ئەگـەر نێردراوەكە منداڵ یان كەم ئەندام (معوق) بـوو، یـان دابین نەئەكرا، ئەوە باشتروایە یەكێك لەباوانی لەگەڵدا بێت(٢)

٦- پاش پشكنینەكە، لەدەرەنجامەكەوە، وەڵامی ئەو پرسیارانە بدرێتەوە، كەپۆلیس كردوویەتی[٣].

سێیەم - مردوو:

١- لاشەی تازە مردوو: ئەبێت بەنووسـراوی ((داوای توێكاری- طلـب التشـریح)) ی پۆلیـس بنـێردرێت. نـاوو تەمــەن و رەگــەزو نیشانەی جیاكەرەوە (العلامات الفارقە) و جۆری پۆشاكی لەپارچە مقەبایەكدا بنووسرێت و لەمەچەكی ببەسترێت. نووسراوی داوای توێكـــاریش، نـــاوو لایـــەنی نـــێرەرو ژمـــارەو بـــەرواری تیابنووسرێت(٤).

ئەگـەر مرۆڤەكـە لەنەخۆشـخانەدا مردبـوو، ئـەبێت (دۆسیە — فایل) ەكەی بنێردرێت بۆ بەشی پزیشكی‌ی دادوەری.

بائەوەش روون بكەینەوە، كەمەبەستمان لەلاشەی ئەو مرۆڤانە نی‌یە بەنەخۆشی ئاسایی ئەمرن و هیچ گومانێك لەمەرگەكەیان دا نی‌یـە. بـەڵكو مەبەســتمان لـەبریندار، ژەهرخـواردوو، قوربـانی هۆكـارە سروشـتی‌و دەسـتكردەكان (وەك ئەلـەكتریك)، خنكـاو، خنكێـنراو، مردنـی كت‌وپـڕ، مردنـی بـەگومان و مـــەرگی چاوەڕێنەكراوە.

٢- لاشـەی گـەنیو: تاگەنینەكـە زۆرتـر (پێشـكەوتووتر) بێـت، روخسـارو هـۆی مردنەكـەی شـێواوو نادیـارتر ئـەبێت. ئەمــەش لەوانەدا رووئەدات كەبەتەنیا ئەژین و درەنگ بەمەرگیان ئەزانرێت یـان درەنـگ لـەناو دەرئـەهێنرێن، یـان لەچۆڵەوانی‌یـەكان دا

ئەدۆزرێنـــەوە یـــان پـــاش هەڵدانـــەوەی گـــۆڕ (بۆمەرگـــە گوماناوی‌یەکانی کە بێ‌پرس ئەنێژرێن) ئەپشکنرێن.

بەڵام هـەندێك جـار، لاشـە گەنیوەکـە شـکاوی‌یەکی ئاشـکرای هەیـە. یـان پارچـە تەقەمـەنی یـان گوللەیـەك لەلاشـەکەی‌دا ئەدۆزرێتەوە، بەمـە هـۆی راسـتەقینەی مـەرگ (السـبب الحقيقـي للوفاة) ە کە بۆ کارمەندانی پزیشکی‌ی دادوەری ئاسان ئەبێت[٥].

٢ـ پارچـە لاشـە: لـەم بارودۆخـەدا بـەژن و بـاڵاو پۆشـاك، یارمـەتیمان ئـەدەن بـۆ ناسـینەوەو سـەلماندنی کەسـایەتی مردووەکە. ئەگەر مردووەکە ناسراوبوو یان لەگۆڕ دەرهێنرا، ئەوا ئەبێت، پاشماوەی لاشەکە، لەگەڵ بەژن و باڵای ناسراوی پێش مردنەکەدا بەراورد بکرێت.

شوێنی رووداو، هەڵدانەوەی گۆڕ: هەندێك جار دادگا فرمانی هەڵدانـەوەی گۆڕێـك دەرئـەکات، ئەمـەش کـاتێك گومـان یـان سکاڵایەك لەمردنەکە هـەبێت. لێرەدا دادگـا دکتـۆر بـانگ ئـەکات (بەنووسراوێك) تاله هەڵدانەوەی گۆڕەکەدا ئامادە بێت و گومانەکە یەك لا بکاتەوە.

ئـەبێت دکتۆرەکـە پـاش ئـەوەی ئـەم نووسـراوەی پێ‌ئـەگات، کات‌و شـوێن و بـەرواری بانگێشـت و پشـکنینەکە تۆمـار بکـات. شتی پێویست بۆ توێکاری و وەرگرتنی نمونەی شانەیی (النماذج النسيجيه) و شلەکانی لەش لەگەڵ خۆی ببات. بۆهاوکاری‌کردنی، جگە لەنوێنـەری دادگاو پۆلیس و خاوەن سـکاڵاکە یـان کـەس و کاری مردوەکە بەردەستێك یان یاوەرێك داوا بکات.

کەگەیشتنە شوێنی گۆڕەکە، پێش هەڵدانەوەی، نموونەیەك لە خۆڵـی (نیـو) مـەتر لـەدەوری گۆڕەکـە وەربگـیرێت، ئـەم نموونانـە لـەخۆڵی هەرشـەش لای لاشـەکەوە وەرئـەگیرێت، بەتایبـەتی (ژێرلاشـە) کە، کەزۆربـەی شـلەی لاشـەکەی پیـا ئـەچۆڕێت. هـەر

نموونەیەك ئەكاتە شووشەیەكی پاكەوە، شـوێنی وەرگرتنەكـەی لەسەر ئەنووسێت.

پاشان كەسـایەتی مردووكە ئەپشكنێت و پـاش سـەلماندنی كەسایەتی‌یەكەی، دەسـت ئـەكات بەپشـكنینی ئاسـایی خـۆی. لەكۆتاییدا بەهێمنی و وردی راپۆرتەكـە رێـك ئـەخاو پێشكەشـی دادگای ئەكات.

بەشی دووەم

# نیشانەکانی مەرگ

***پێناسەی مەرگ:*** بریتی‌یە لەو بارەی لەئەنجامی وەستانی هەمیشەیی هەرسێ کۆئەندامە کاریگەرەکەی دەمارو سوڕی خوێن‌و هەناسەوە بەسەر لەشی مرۆڤ دێت[٦].

وەستانی هەریەك لەم کۆئەندامانە، نیشانەی تایبەتی لێوە دەرئەکەوێت:

١ـ کۆئەندامی دڵ و سوڕی خوێن:

بەوەستانی دڵ دەست پێ ئەکات، لێدانی دڵ لەمەچەك دا هەست پێ ناکرێت، ترپەی دڵ بەبیستەری پزیشکی (السماعە الطبیة) نابیسترێت. گەر نەخۆشەکە لەخەستەخانە بوو، نەواری دڵ (تخطیط القلب)ی بۆکرا، هێڵێکی راست تۆمار ئەکات. پاش مەرگ وردە وردە روخسار لەسەرەوە بەرەو خوار رەنگی ئەپەڕێت و زەرد ئەبێت.

٢ـ کۆئەندامی هەناسە:

جووڵەی سنگ و هاتووچۆی هەوا (هەناسە) ئەوەستێت، هەندێك جار مردووەکە چەند هەناسەیەك هەڵئەمژێت بێ ئەوەی هەناسەکان بداتەوە! جاران بۆ دڵنیا بوون لەم وەستانی هەناسەیە، پەڕێك ئەخرایە بەرلووتی تا بزانرێت لەگەڵ تەوژمی هەوای (هەناسەدان)دا ئەجولێت یان ناجولێت. یان ئاوێنەیەك بەرامبەر دەم‌و لووت رائەگیرا، گەر تەمێك لەسەر ئاوێنەکە دروست بووایە، وادائەنرا، کەهێشتا هەناسە ئەدات.

٣ـ کۆئەندامی دەمار:

هەستەکانی نامێنن، مردووەکە ورتە و جوڵەی لێ نایەت، چاوی ئەبڵەق ئەبێت، دەمارە فرتەی پەرگلێنە (الانعكاس القرني) نامێنێت. ماسولکە خۆویستەکانی (الارادیە) شل ئەبن و ئەم شلی‌یە لاشەکە قورس ئەکات و بەگرانی ئەم دیوو ئەو دیوی پێ ئەکرێت، یان ئەگوێزرێتەوە.

هەندێك جار پاش وەستانی ئەم کۆئەندامە، پاشماوەی شێواوی فرمانەکەی، هەندێك جووڵەی هەرەمەکی ماسولکەکان (لنگەفرتێ ــ حرکات النزع)ئەبینرێت. هاوکات لووشە ماسولکەکانی هەناو ئیفلیج ئەبن، بەمە مردووەکە میزو پیسایی ئەکاتە ژێر خۆی یان لەوانەیە شلە و خۆراکی ناوگەدەی هەڵبێنێتەوە. بۆ کەسێکی ناشارەزا ئەم دیاردانە بە نیشانەی ژیان دائەنرێت.

*گەندە مەرگ (الحياة المعلقة)*

لەم بارەدا فرمانی کۆئەندامی لەش هێندە سست ئەبن، بەرووکار لەمردوو ئەچێ. گەرچی هیچ نیشانەیەکی ژیانی تیا بەدی ناکرێت. بەڵام هێشتا مرۆڤەکە زیندووە، ترپەی دڵ هێندە لاوازو هێواش ئەبێت، بەبیستەر لەسەر سنگ دا نابیسترێت، بەپەنجە لەمەچەك دا هەستی پێ ناکرێت[٧]. هەست بەهەناسەی ناکرێت، فرتە دەماری‌یەکانی نامێنێت.

ئەم بارودۆخە لەهەندێ باری ئاسایی‌ی وەك یاری (یۆگا) و لەهەندێك مرۆڤی پیردا ئەبینرێت، بەتایبەتی ئەوانەی نەخۆشی دەروونی و دەماری‌یان هەیە[٨].

بەڵام ئەوەی لای ئێمە گرنگە، گەندەمەرگی خۆنەویست (اللاإرادي) ە، وەك ئەو نۆبوو (نەوزاد ــ حديث الولادە)ەی

کەلەدایك ئەبێت و هیچ نیشانەیەکی ژیانی تیا نییە. گەرچەند خولەکێك وا هێڵرایەوە، ئەمرێت.

یان ئەوانەی لە ئاو دەرئەهێنرێنەوە، گەر لەچەند خولەکێك دا نەژیاندرانەوە، ئەوا ئەمرن. یان ئەوانەی بەرهەورە تریشقە (بروسکە) ئەکەون، تەزووە ئەلەکتریکییەکەی زیان بەمێشکیان ئەگەیەنێت. لێدانی دڵ خاوو لاواز ئەکات و هەستی پێ ناکرێت، گەر فریایان نەکەوین، ئەمرن.

لەم بارانەدا دکتۆرەکە هەست بەهیچ نیشانەیەکی ژیان ناکات و مرۆڤەکە بەمردوو دائەنێت و لەم هەڵەیەوە زۆر چیرۆکی لێ دروست ئەکرێت وەك[٩] : ((دکتۆرێك پاش پشکنین، بەڵگەنامەی مردن بۆ بێوەژنێکی (٧٨) ساڵە دەرئەکات، ئەم پیرەژنە بەمردوویی، بەپاڵ کەوتوویی لە ماڵەکەی خۆیدا دۆزرایەوە، شوشەیەکی بەتاڵ (خەپلە ـ حب)ی خەواندن و چەند نامەیەکی لەلاوە کەوتبوو، کەباسی خۆکوشتنی ئەکرد. پاش پشکنین نێردرا بۆتوێکاریگا (المشرحە)، پاشتر ئەفسەرێکی پۆلیس تێبینی کرد کەهێشتا هەناسەی تیا ماوە، بەپەلە برا بۆ خەستەخانە، بەلام رۆژی دوایی مرد)).

ئەم گەندە مەرگە لەوانەش دا ئەبینرێت کەژەمێکی زۆر (بەنگ ـ افیون) بەکار ئەهێنن، جگەلەوەی لە هەندێك نەخۆشی سەخت و بێ چارەشدا ئەبینرێت.

نیشانەیەکی تری مەرگ کەجاران بەبێ گومان دائەنرا، بریتییە لە (رەنگ زەردی مردوو)، کەئێستا بە نیشانەی مردن دانانرێت. چونکە ئەم رەنگ زەردییە، لەژیانیش دا رووئەدات، وەك ئەوانەی خوێنرێژی (النزیف) ی توندیان هەیە. یان ئەوانەی پێست سپیو کەم خوێنن، لەکاتی ترسان و تۆقین دا، رەنگیان زەرد ئەبێت.

جگە لەوە ئەوانەی بە (یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن) ئەخنکێن و ژەهراوی ئەبن، رەنگیان زەرد نابێت. یان ئەوانەی (رەق) ئەبنەوە، لەجیاتی ئەوەی رەنگیان زەرد هەڵگەرێت، رەنگیان سووری گەش ئەبێت. لەگەڵ پێشکەوتنی پزیشکیدا، زۆر تاقیکردنەوەو ئەزمایش (فحوصات) پەیدا بووە، کەمەرگ و ژیان لێک جیابکاتەوە، هەندێکی گرانە و پێویستی بە ئامێری زۆر پەرەسەندوو هەیە، بەڵام زۆربەیان بەئامێرێکی ساکار ئەکرێن؛ وەك:

١ـ فرتە دەماری‌یەکان بەچەکوشێکی پلاستیکی تاقی ئەکرێتەوە.

٢ـ فرتە دەماری بیبیلە (الانعکاس البؤبؤي)، لەژیاندا هەیەو لەگەڵ مەرگ نامێنێت[١٠]، بەلایتی گیرفان تاقی ئەکرێتەوە.

٣ـ چاو، بە ناوچاوبین (ناظور العین) ئەپشکنرێت، کەسووری خوێنی ناو بۆریەکانی تۆڕە (الشبکیە) ئەوەستێت. پارچە پارچە (شدفە) ئەبێت[١١]. ئەمەش بەباشترین بەڵگەی مردن دائەنرێت، ئەئەیەکەم دووکاژێری مەرگدا پشتی پێ ببەسترێت[١٢].

٤ـ پەستانی ناو چاو لەزیندوودا (١٤ـ٢٥) ملم جیوەیەو نیو کاژێر پاش مردن، دائەبەزێت بۆ (٣ملم جیوە)، پاش دوو کاژێر ئەبێت بە (سفر)[١٣].

٥ـ چاو لەگەڵ مردن ئەکرێتەوە و ئەبلەق ئەبێت. لەکاژێرێك دا، پاش مردن، پەرگلێنە (القرنیە) تاریك ئەبێت، پاش چەند کاژێرێك بەتەواوەتی تۆخ ئەبێت [illegible] جار سێگۆشەیەکی قاوەیی لەسەر دروست ئەبێت، بنکەکەی رو [illegible] ئەبێت.

ئەزمایشەکانی‌تر، وەك نەواری دڵ (تخطیط القلب)و نەواری مێشك (تخطيط الدماغ) هەردوکیان لەگەڵ مردن دا، هیچ ناخوێننەوەو هێڵێکی راست دەرئەخەن. بەڵام ئەبێت ئەوەش بڵێین

که نەواری مێشک لەخواردنی هەندێك ژەهرو دەرمانی کۆمەڵەی (باربیتورەیت)، بەبێ مەرگ، هێڵێکی راست دەرئەخات.

ئەبێت دکتۆر ئەوەی لەیاد بێت، گەر هەڵەیەك بکات لەناسینەوەی زیندوو یان سەلماندنی مەرگ دا، ئەوا لەوانەیە ببێت بەهۆی مردنی زیندوویەك. بۆیە ئەبێت هەموو شێوازو توانای خۆی بەکار بهێنێت بۆ سەلماندنی مردن و وەستانی هەرسێ کۆئەندامە کاریگەرەکان. بۆ ئاسان کردنی ئەم ئەرکە، چەند تاقیکردنەوەیەکی ئاسان باس ئەکەین، تابتوانین خۆمان لەم جۆرە هەڵانە بپارێزین،

١- تاقیکردنەوەی (ئیکارد)؛ ٨ملم تێکەڵەی ئاو و (فلۆرسین و سۆدیۆم بایکاربۆنەیت) لەژێرپێست ئەدرێت، لەمردوودا هیچ دەرناکەوێت، بەڵام لەزیندووی گەندەمەرگ دا رەنگێکی زەردی سەوز باو لەناوچەی دەرزی لێدانەکەدا دەرئەکەوێت.

٢- تاقیکردنەوەی (ماگنێس)؛ بنی پەنجەیەك بەپەتێك شەتەك ئەدرێت، لەزیندوودا پەنجەکە ئەئاوسێت و لەمردوودا نائاوسێت.(١٤)

**نیشانەکانی مردن:**

کاتێك دکتۆرێك بانگ ئەکرێت بۆ بینین و پشکنینی مردوویەك، سێ ئەرکی دێتە سەرشان(١٥)

١- دڵنیا بێت کەبەراستی مردووە.

٢- وریا بێت نەك مردنەکە گوماناوی بێت.

٣- بڕوانامەی مەرگ (شهادةالوفاة) لەکاتێك دا پڕبکاتەوە گەر مردووەکە پێویستی بەوە نەبوو کەبنێردرێت بۆ پزیشکی دادوەری.

ئایا بەڕاستی مردووە؟ زۆرجار نیشانەکانی مەرگ ئاشکران، بەڵام پاش لێدانی ئەلەکتریکی، کەوتنە بەر بروسکە

(هەرورەتریشـقە لێـدان)، یـان کەوتنـە ئـاوەوە، گومـانێك یـان کەڵکەڵەیەك ئەکەوێتە دڵی دکتۆرەکەوە.

نـابێت پزیشـك کـات بـەفیڕۆ بـدات، ئەگـەر گومـانی کـرد، لەوەئەچێت هێشتا ژیـانی تیـا مـابێت یـان لـەباری گەندەمـەرگدا بێـت، پێویسـتە بۆمـاوەی (٤-٥) خولـەك بەبـەردەوامی هـەوڵی (ژیاندنەوە- انعاش)ی بدات(١٦).

ئایـا هیـچ گومـانێك لەمردنەکـە ئـەکرێت؟:ـ ئەگـەر دکتۆرێـك گومـانی لەشـێوەی کـەوتنی لاشـەکە کـرد یـان برینداری‌یـەکی پێوەدی، یان ژەهر، یان دەرمـانێکی لـەو دەوریـەرەدا بینـی، باشتر وایە لاشەکە بنێرێت بۆ توێکاری لەپزیشکی‌ی دادوەری.

گۆڕان و نیشانەکانی مەرگ و پاش مەرگ

لەگـەڵ مردنـدا هەرسـێ کۆئەندامـە کاریگـەرەکانی دەمـار و سـووری خوێـن و هەناسـە لـەکار ئەکـەون. گـەر مرۆڤەکـە لەخەستەخانەدا مـرد، ئـەوا نـەواری دڵ و نـەواری مێشك یارمـەتی دەرن. لەنیشانەکانی تری مەرگ نەمانی هەناسەو ترپەی دڵ زیاتر لە (٥) خولەك، شل بوونی ماسولکە خۆویستەکان(١٧).

گۆڕانکاریە بنەڕەتیەکانی پاش ساتی مردنیش بریتین لە:

١- نیشانەسەرەتایی‌یەکان(١٨)

- گۆڕانەکانی چاو وناوچاو
- شلی ماسولکەکان
- کرژبوونی مەرگی

٢- نیشانە مام ناونجی‌یەکان (لەیەکەم ١٢کاژێردا) روونەدەن:

- سارد بوونەوەی لاشە
- رەق بوونی مەرگی
- خوێن نیشتن

٣- نیشانە درەنگەکانی مەرگ:

- بۆگەن کردن

- بوون بەسابون

- بوون بەمۆمیا

یەکەم: گرژبوونی مەرگی (التشنج الموتی)

ئەمەش پەیوەندی بەمردنێکەوە هەیە، زۆربازی تیا رووی دابێت. لەگەڵ مردن دا دەست پێ ئەکات و تاپاش (رەق بوونی مەرگی) ئەمێنێتەوە.



گرژی‌یەکە بەتایبەتی لەدەستدا دەرئەکەوێت، وەك ئەوەی چەکی خۆکوشتنەکەی تیاگیر بخوات، یان کاتێك خنکاوێك هەوڵی خۆرزگارکردن ئەدات گژوگیای ئاوی تیابێت. ئەوسەربازانەی لەبەرەی جەنگ دا ئەکوژرێن، ئەشێت لەبەر ترس و خۆتووند کردنیان، هەموو لەشیان گرژ ببێت.

دووەم: ساردبوونەوە (تبرد الجسم)

لەگەڵ مردن دا، لەئەنجامی وەستانی چالاکی خانەو سووری خوێن، لاشە بەخێرایی سارد ئەبێتەوە. وەك هەموو تەنێکی مردووی تر، پلەی گەرمای لەش وەك لەخوارەوە روونی ئەکەینەوە: لەگەڵ پلەی گەرمای دەوروبەردا هاوسەنگ ئەبێت.

لەئاوو هەوای فێنکدا، لەنیو کاژێردا هەست بەساردی لاشەکە ئەکرێت[٢٠]. لەبەرچینی چەوری ژێر پێست و شی‌بوونەوەی گلایکوجینی ناوجگەر، هەناو درەنگتر لەرووکاری لەش سارد ئەبێتەوە، بگرە تاچەند کاتژێرێك پاش مردن هەر وەك خۆی ئەمێنێتەوە[٢١]. بەلام پاش (١٢)کاتژێر گەرمای ناو هەناو وەك دەرەوەی لێ دێت. ئەم سارد بوونەوەیە، بەبەڵگەیەکی راستەقینە

دائـەنرێت، بۆدیـاری کردنـی نزیکـترین کـاتی مردنەکـە. بـۆ ئـەم مەبەسـتەش گـەرماپێوێك بـەکاردێت، تـا (سـفر) بخوێنێتـەوەو لەرێی کۆم (الشرج)ـەوە، لە رێکە (المسـتقیم) دائـەنرێت[٢٢] ... نابێت بەهیچ شێوەیەك کیلـەك (المهبل) بەکاربهێنرێت بۆ پێوانـی پلەی گەرمای مردووەکە.

پلەی گـەرمای لـەش، تالـە دەوروبـەر بـەرزتر بێـت، بـەخێرایی بـەهێندی (پلـەونیو)یـك لـەکاژێرێکدا[٢٣]، دائەبـەزێت. لەشـەش کـاژێری یەکـەمدا بـەڵام لەشـەش کـاژێری دووەمـدا (یـەك پلـە) ی سەدی لەکاژێرێك دا، دائەبەزێت.

ئـەم هۆکارانـەی خـوارەوە، رێـژەی سـاردبوونەوەکە کـەم ئەکەنەوە:

- ئاووهەوای گەرم
- جلوبەرگی زۆر، یان ئەستور
- پێخەف و داپۆش
- قەڵەوی
- نەبوونی شنەو تەوژمی با
- خوێن بەربوونی مێشك
- خنکاندن (الخنق)
- مێرووله تێدانی لاشەکە

ئەم هۆکارانەی خوارەوە، ساردبوونەوە، خێرا ئەکەن:

- رووتی، بێبەرگی (نیوجار خێرای ئەکات)
- کەوتنە ئاو (دووجار خێرای ئەکات)

لـەکاتی پێوانـی پلـەی گـەرمای لاشـەکە؛ تێبینـی ئـەم خاڵانەبکە(٢٤):

١ـ تـاجل وبـەرگی زۆرتـر و ئەسـتورتری لەبـەردا بێـت، ساردبوونەوە هێواشترەو بەپێچەوانەوە.

٢ـ لـەش و لار؛ تاقەڵـەوتر بـێ، سـاردبوونەوە هێواشـترەو بەپێچەوانەوە.

٣ـ تەوژمی با؛ گەرمەبێت، زۆر بێت؛ ساردبوونەوە خێراتر ئەبێت و بەپێچەوانەوە.

٤ـ پلەی گەرمای دەوروبەر؛ تازۆرتر بێت، ساردبوونەوە هێواشترەو بەپێچەوانەوە، تکایە بڕوانە ئەم نەخشەی خوارەوە:

| لەناو ئاودا | لەوشکایی‌دا | کات بەکاژێر |
|---|---|---|
| پلەو نیوێك دائەبەزێت | یەك پلەی سەدی لەکاژێرێکدا، دائەبەزێت. | ٠ ـ ١٢ |
| سێ لەسەر چواری پلەیەك دائەبەزێت. | نیو پلەی سەدی لەکاژێرێکدا، دائەبەزێت. | ١٢ ـ ٢٤ |
| لەنیو تا (٦) کاژێردا هەست بەساردی لاشەکە ئەکەیت. | لەنیوتا (١٢) کاژێر هەست بەساردی لاشەکە ئەکەیت. | |
| لە (٨-١٠) کاژێردا لاشەکە سارد بووەتەوە | لە (٢٠-٢٤) کاژێردا لاشەکە سارد بووەتەوە. | |

سێیەم: خوێن نیشتن (البقع الرمیة)

لەئەنجامی سست بوونی بۆرییەکانی خوێن(٢٦)؛ وەلەبەر ئەوەی خوێن تا (١٢)کاژێر بەشلی ئەمێنێتەوە(٢٧). لەژێر کاریگەری تاودانی زەوی (تعجیل الارض)دا خوێنەکە لەناوچە نزمەکانی لەش دا ئەنیشێت. ئەگەر پێست یان ئەوبەشە نزمەی لەش پەستانی نەبێت، وەك ئەوەی مردووەکە لەسەر پشت کەوتبێت، خوێنەکە لەپشتی دا ئەنیشێت. بەڵام ئەو شوێنانەی سەر ئێسقانی دەفەی شان (لوح الکتف) و بڕبڕەی پشت

(الفقرات الظهرية)، كە ئەكەونە ژێر پەستانی نێوان قورسایی لاشەكەو ئەو شوێنەی لاشەكەی لەسەر كەوتووە، خوێنی تیا نانیشێت، بەم



شێوەیە لەكاتێك دا هەموو پشتی مردووەكە رەنگی سوور یان وەنەوشەیی ئەگرێت؛ ئەم دووشوێنەی باس كران بەزەردی ئەمێنێتەوە.

ئەم خوێن نیشتنە لەنێو كاژێردا دەست پێ ئەكات و لە (٥-٦) كاژێردا بەئاشكرایی دەرئەكەوێت. پاشان ئەو گڕوگازانەی كەلە لاشەكەدا دروست ئەبێت، گەنینەكە ئەگەیەنێت بەخوێن و گەنینی خوێنەكە ئەم رەنگە كاڵ ئەكاتەوە.

لەبەر ئەوەی خوێن تا (١٢) كاژێر بەشلی ئەمێنێتەوە، ئەگەر لاشەكە لەم ماوەیەدا هەڵگێردرایەوە، ئەوا خوێن نیشتنەكە ئەگۆڕێت و دیسان لەشوێنە نزمەكانی لاشەكەدا ئەنیشێتەوە(٣٠).

ئەبێت ئەوەمان لەبیرنەچێت، كەئەم خوێن نیشتنە لەهەناو (الاحشاء)یشدا روودەدات؛ بۆنمونە لەبەشی ژێرەوەی ریخۆڵەكان و لووی خوارەوەی سییەكان دا ئەنیشێت. ئەبێت ئاگاداربین لەكاتی توێكاری لاشەكەدا ئەم دیاردە (ظاهرة)یە بەنەخۆشی یان دەرەنجامی زەبر (الشدە) دانەنێین. ئەتوانین ئەم سوودانەی خوارەوە لەم دیاردەیەوە، دەست بخەین؛

١ـ چۆنیەتی کـەوتنی لاشـەکە: بۆنمونـە منـاڵێك کەلەپـەوروو ئەکەوێت و دەموچاوی لەپێخەفەکەی ئەچەقێت و ئەمرێت، ئـەوا خوێن نیشتنەکە لەبەشی پێشەوەی لەشـیدا ئـەبێت و ئەوبەشـەی دەم و چـاوی کەچــەقیوەو پەســتانی لەســەرە، بــەزەردی ئەمێنێتــەوە.... چونکــە هــەموو جــارێك بــاوانی مردووەکــە بۆپـرس‌ورای لێکۆڵینـەوە نـاتوانن شـێوەی کـەوتنی مردووەکـەیان بهێننـەوە یـاد،. بـەڵام چۆنیـەتی نیشـتنی خوێنەکـە، جـۆری کەوتنەکەمان بۆ ئەسەلمێنێت.

٢ـ ئەتوانێت کـاتی (نزیکـەی) ڕوودانـی مردنەکەمان، لـەدوانزە کاژێری یەکەم دا بۆدەست نیشان بکات.

٣ـ ڕەنگـی خوێنـە نیشـتووەکە، ڕەنگـی خوێنـی مردووەکەیـە لەکاتی مەرگ دا بۆ نمونـە: لەشین بوونـەوە (cyanosis ـ الازرقاق) داخوێنەکە شینە، ئەمـەش دەرەنجامی کـەم ئۆکسـجینی خوێنـە. لـەمردنی ژەهـراوی بـوون بـە (یەکـەم ئۆکسـیدی کـاربۆن) ڕەنگـی خوێنەکـە (پەمــەیی)یــەو لەهــەندێ ناسـاغی خوێـن (وەك Met haemoglobinemia) دا ڕەنگی خوێنەکە قاوەیی‌یە(٣١). هەروەها لـەژەهراوی بـوون بەئاوێتــە (فســفۆری‌یەکان) خوێـن نیشـتنەکە قاوەیی‌یە(٣٢).

هەندێك جار، ئەم خوێن نیشتنە لە (شین بوونەوە)ی دوای زەبر (الشـدة)دا جیاناکرێتـەوە. لەم کاتـەدا ئەگـەر پێسـتی سـەر خوێـن نیشــتنەکە بـبڕین، ئــەوا خوێنـە نیشـتووەکەی لێدێتــە دەرەوەو ناوچەکە بێ ڕەنـگ بەجێ دێڵێت. بەڵام لـەکاتی شـین بوونـەوەی (زەبـری)دا، خوێنەکـە بـەتوندی بەشـانەکانەوە لکـاوەو ڕەنگــی کردووە، گەرپێستی سەر شین بوونەوەکەمان بڕی، خوێنەکەی لێ نایەتە دەرەوەو ناوچەکە هەربەشینی ئەمێنێتەوە.

بۆئەوەی هیچ گومانێکی تیا نەهێڵینەوە، ئەگەر پێستەکەمان لەژێر وردبین (المجهر- مایکروسکوب)دا پشکنی، ئەوا یەك لایی ئەبێتەوە(٣٣).

چوارەم: رەق بوونی مەرگی (الصمل الرمی)

پاش مردن (ATP) ی ناوخانەکان تێك ئەشکێت و ئەبێت بە (AP)، کەلەماسولکەکان دا کەڵەکە ئەبێت و ئەبێتە هـۆی ئـەوەی (فۆسفەیت) و (لاکتـەیت) ی نـاو ماسـولکەکان دەجـار ئـەوەندەی باری ئاسایی‌یان لێبێت... ئەمەش ئەبێتە هۆی چەند گۆڕانێکی فـیزیکی لەماسـولکەکان دا، وەك کـورت بوونـەوەو رەق بوونـی ریشاڵە ماسوولکەکان. بەمە هەموو ماسولکەکان رەق ئەبن و بەرز ئەبنەوەوپەلەکان رەق ئەبن(٣٤).

گـەرچی ئـەم رەق بوونـە، لەهـەموو نیشـانەیەکی تـری مـردن، ناسـراوترە، بـەڵام شـوێن گومانـە. گەرمردووەکـە خویـاو یـان ئۆکسـجینی لـەپێش مردنەکـە درایـە، یـان پـاش مـردن خرایـە سەهۆڵەوە، ئـەوا ئـەم رەق بوونـــــــــە دوا ئەکـەوێت و هـەندێك جار نابینرێت[٣٥]. ئەم رەق بوونـە لەماسـولکە بچوکـەکانی دەم و چاوەوە دەسـت پێئـەکات(٣٦) و لـە (٥-٧) کـاژێردا ئیـتر دەم ناکرێتەوە(٣٧). لە (٢-٣) کاژێری تردا، شان و باڵ ئەگرێتـەوە... پاشان ماسولکەکانی ران و لاق. لـە (١٢) کـاژێردا ئەگاتـە پۆپـەو (١٢) کـاژێر ئەمێنێتـــەوەو (١٢) کـاژێری تـری ئـەوێت تادیـار نـامێنێت(٣٨). دیـــار ئەمانەکەشـــی هەرلەســـەر شـــێوەی



دەرکەوتنەکەی (یەکەم جار دەموچاو... هتد) روودەدات (٣٩) لاشەکە لەو شێوەیەدا بەجێ ئەهێڵێت، کەپێش رەق بوونەکە بووە.

ئەم هۆیانەی خوارەوە، وائەکەن، کەئەم رەق بوونە زووتر دەرکەوێت:

١ـ گەرلەکاتی مردنەکەدا زیندەپاڵی مردووەکە بەرز بوو وەك (تاداری، مەشق کردن).

٢ـ گەرمای هاوین.

٣ـ لەساوادا زوو دەرئەکەوێت و زوودیار نامێنێت.

چوارەم: ژەهراوی بوون، وەك ژەهری (سترکنین ـ Strychnine).

بەشێك لەم دیاردەیە، بەجۆرێکی ترخۆی دەرئەخات؛ کەماسولکەی موو وەستێنی پێست کرژ ئەبێت، مووی لەش ئەوەستێت و پێست وەك پێستی مراوی (goose fleshing) دەرئەکەوێت... ئەمەش تەنیا لەمردن دا روونادات، بەڵکو لەژیانیش دا ئەبینرێت.

هەندێك جار پرۆتینی ماسوولکەکان بەگەرمییەکی زۆر ئەمەیێن‌و ئەم رەق بوونی مەرگییە ئەشارنەوە، .... هەروەها بەستن و زوقماندن، جگە لەوەی ماسولکەکان رەق ئەکەن، رەق بوونی مەرگیش ئەشارنەوەو دوای ئەخەن، کاتێك دەست پێ‌ئەکاتەوە، کەلاشەکە بتوێتەوە.

پێنجەم: بۆگەن کردن (التفسخ)

لەئاووهەوای فێنك دا، لاشەکە لە (٢٤-٣٦) کاژێردا دەست ئەکات بەگەنین[٤١]. خۆرە (میکرۆب) ی بێ باهەناسەیی، گازدروستکەر لەریخۆڵەکان دا زیت ئەبنەوەو ئەگەنە لاتەنیشتەکان و بەشی خوارەوەی لای راستی سك و لەخوێنهێنەری دەرکەوانی (الوريد البوابي ـ Portal vein) ـەوە ئەگەنە خوێن. خوێن

شیئەکەنەوەو شانەکان رەنگ ئەکەن.[42]. لەسەرەتادا ئەم رەنگە مۆرێکی سەوزباوە(٤٣)، پاش کەمێك رەنگی سورباوی خوێنهێنەرەکانی بنجی مل وسەرشان، تۆرێکی وا دروست ئەکەن، لاشەکە وەك (مەرمەڕ) ی لێبێت. پاشتر ئەم (مەرمەڕ رەنگە) بەرەو لامووسەڵان تەشەنە ئەکات، تاهەموو لاشەکە ئەگرێتەوە[44]. کاتێك



شیبوونەوەکە گەیشتە دروست بوونی ($H_2S$) رەنگە سوورەکە ئەگۆڕێت بەوەنەوشەیی سەوزباوو بۆگەن پەیدا ئەبێت.

لەگەڵ مردن دا، خۆشیتەڵکردنەوەی شانەکان (التحلل الذاتی) بەهۆی تێك شکانی خانە و بڵاوبوونەوەی ئەنزایمەکانی ناوخانە، دەست پێ ئەکات[45]، تالاشەکە هەڵئەئاوسێت، لەش فووی تێ ئەکرێت و شلەی تێ ئەزێت و رەنگورووی مردووەکە ناناسرێتەوە. لەکۆتاییدا رەنگ گۆڕینەکە بەهەموو لەش دا بڵاوئەبێتەوەو بلق لەپێست دا دروست ئەبێت. پاشان پێستەکە هەڵئەماڵرێت. لەگەڵ داماڵینی پێستی دەست و پێدا، نینۆکەکان بەئاسانی هەڵئەوەرێن و هاوکات قژەسەر بەئاسانی هەڵئەماڵرێت[46].

ئەم هۆکارانە کارلەبۆگەن کردن ئەکەن:

١ـ پلەی گەرما: گرنگترین هۆکارەو تابەرزتربێت، گەنین خێراترە.

٢ـ خۆرە (میکرۆب): تازۆرتر بێت، زووتر ئەگەنێت.

٣- تەوژمی هەوا: تاتەوژمی هەوا هەبێت و توند بێت، گەنینەکە دوا ئەکەوێت و بەپێچەوانەوە.

٤- شێداری: تازیاتر بێت، زووتر ئەگەنێت.

٥- مێروولەو مێش و مەگەز: کەدایانەلاشەکە، زووتر ئەگەنێت.

٦- ناشتن: زووناشتن، گەنین دوائەخات.

٧- کەوتنە ئاو: گەنین هێواش ئەکاتەوە.

هەموو بەشەکانی لەش پێکەوە ناگەنن، بەڵکو لەکاتی جیاجیادا دەست بەگەنین ئەکەن، واله خوارەوە بەپێی زووگەنین، هەندێك ئەندام دەست نیشان ئەکەین:-

١- ریخۆڵە، گەدە، خوێنی جگەر ودڵ و خوێنی تر، دڵەماسولکە.

٢- رارەوی هەناسە، سی، جگەر.

٣- مێشك و پەتکە دەمار (النخاع الشوكى).

٤- گورچیلە، میزەڵدان، گوون.

٥- ماسولکە خۆویستەکان.

٦- منداڵدان و پرۆستات

ئەمەش ئەوەمان بۆ روون ئەکاتەوە، گەرچی لاشەکە بەرووکار زۆر گەنی بێت. بەڵام هەندێك ئەندامی وەك منداڵدان و پرۆستات و گورچیلە، هەربەنەگەنیوی تاماوەیەکی زۆر ئەمێنێتەوەو لەدۆزینەوەی هەندێك ژەهردا، بەسوودن.

شەشەم: مۆمیابوون (التحنيط)

وروشکەگەرمای وەك بیابان و ناو دوکەڵکێشەکان، شیبوونەوەو گەنین رائەگرن. بەتایبەتی ئەگەر تەوژمی هەوایەکی وروشکی لەگەڵدابێت [٤٧]. بەمە لاشەکە وشك ئەبێتەوە و وەك چەرم قاوەیی و رەق ئەبێت و بەسەر پەیکەری ئێسك (الهيكل العظمى) دا ئەجەرێت و لاشەکە ئەبێت بەمۆمیا [٤٨].

نەوبوو (نەوزاد)، پاکژوبێ میکرۆبە، ئەگەر پاش مردن، بخرێتە سندوقێکی پتەوەوەو بخرێتە شوێنێکی فێنك، ئەبێت بەمۆمیا.

گەرچی روخساری لاشەکە، بەچاکی ئەمێڵێتەوە، بەڵام ئەگەر مێروو مۆریانەی گەیشتێ، شانەکانی شی ئەکاتەوەو هەڵی ئەوەرێنێت.

**گۆرانەکانی پاش مردن، گەرلاشەکە لەئاودا بێت:**

بای ساردی قەراغ ئاو و ساردی ئاوەکە، ماسولکەی موو وەستێنی پێست، گرژئەکەن. بەمە مووەکان رەپ ئەبن و پێستەکە



وەك پێستی مراوی لێ دێت. لەبەر ئەوەی لەکەوتنە ئاودا، سەر پێش لەش ئەچێتە ژێر ئاوەکەوە، خوێن لەسەرومل دا ئەنیشێت.

کەگەنین دەستی پێ کرد، ئەوا یەکەم جار لەدەم و چاو و مل دا دەست پێ ئەکات، بەڵام گەنینەکە لەئاودا دووجار وەك لەسەر وشکانی هێواشترە. ئەو رەنگە مۆرە سەوزباوەی لەدووەم و سێیەم رۆژدا لەسەر وشکانی دەرئەکەوێت، لەلاشەی ناو ئاودا دەرناکەوێت، بەڵکو لەکۆتایی هەفتەی یەکەم دا لەمل دا دەرئەکەوێت. لەوانەیە گەر ئاوەکە سارد بێت لە (٦-١٠) رۆژە، هێندە گژوگاز لەلاشەکەدا دروست نەبێت، کەسەرئاوی بخات. بەڵام لەگواوو ئاوی گەرم دا، گەنینەکە خێرایە.

هاوکات، پێست، پاش (١٠-١٢) کاژێر، ئاو ئەیبات، چرچ و زبر ئەبێت. پاش (١٠) رۆژ ئەم پێستەی دەست و پێ وەك دەستێکێش و گۆرەوەی دائەماڵرێت. لە (٣-٤) هەفتەدا نینۆك و قژەسەر بەئاسانی هەڵئەکەنرێن. وردە وردە گۆشتی لاشەکە شی ئەبێتەوەو پەیکەری ئێسك ئەتەپێت[٤٩]. تەنیا (چەق) ی

جومگەبەند (أربطە المفاصل ــ Ligaments)ـەکان نەبێت کەتاسالێك ئەمێنێتەوەو بەرگەی رزین ئەگرێت و پاش (٣-٥٩)سالْ، جومگەکان لەیەك ئەبنەوە[٥٠].

بێگومان ئەو گۆرانانەی لەسەرەوە باسمان کرد، لەهاوین دا بەنیوەی ئەوکاتە رووئەدەن کەدەست نیشان کرا.

حەوتەم: بوون بەسابوون(التصبن ـ Adipocere)

لەئەنجامی تێربوون بەهایدرۆجین و شیبوونەوەی (ئۆلیك ئەسیدـ Oleic acid)[٥١] ی ناو چەوری لەش بۆچەوری لینْلْو تێری (ستیاریك ئەسیدـ Stearec acid)؛ چەوری لەش ئەئاوسێت و سپیو رەق ئەبێت و بەماسولکە و ئێسك دا ئەلکێت[٥٢] و پاش رزین و داوەرینی پێست وەك خۆی ئەمێنێتەوەو شێوەو روخساری چوارچێوەی لەش وەك خۆی ئەهێڵێتەوە[٥٣].

ئەم گۆرانانە لەئاووهەوای فێنك دا چەند مانگێکی ئەوێت، بەلاّم باران و گەرما، مێروو مەگەز تێدان، ئەم کارلێکە هێندە خێرا ئەکەن، کەلە (٣-٤) هەفتەدا دەربکەوێت.

برینداری لاشە پاش مردن

لەوانەیە لەکاتی ژیاندنەوە یان پاش مەرگ، بەهۆی دەستکاری کردن و گەرم کردنەوەو راکێشان دا، پێست بریندار ببێت و پەراسوو بشکێت و بلْق لەپێسدا دەربکەوێ، یان شوێن گازی پشیلەو رێوی[٥٤] و مشك و ماسی پێوەبێت.

چۆن ئەم برینداریيانەی پاش مەرگ، لەوە جیابکەینەوە، کەپێش مردن رووی‌دابێت؟... ئەمەش ئاسانە، گەرئەوەمان بیر بێتەوە کەلاشەکە مردووە و هیچ (زیندەکارێك ـ تفاعل حیوی)ێکی نابێت. گەر لەژێر ووردبین دا سەیرکرا، هەست بەوە ئەکرێت، کەبرینداریيەکانی کەپاش مەرگ روویان داوە... هیچ نیشانەیەکی چالاکی یان زیندە کارلێکی خانەی پێوە دیارنییە.

بەچاویش، برینداری‌یـەکان قـاوەیی ئـەبن، قەرەغـەکانی تیـژ، وەك چەرم رەق ئەبن و دەوروبەرەکەی سوور نابێتەوە.

ونجرکـردن وگـازی ئـەو گیاندارانـەش بـەوە جیائەکرێتـەوە، کەلەنزیك برینەگەورەکەوە، جێ چڕنوك و دانی ئاژەڵەکانی پێوە ئەبینرێت(٥٥).

بەشی سێیەم

# بـرینـەکـان

پێناسـە: بریــن بریتـی‌یـە لەهــەموو پچڕانێکـی پێسـت یان شانەکانی تر، لەئەنجامی هۆکاری سروشتی یان کیمیکی کەشانە قوڵەکان بەرەو رووی دەرەوە ئەکاتەوە[٥٦].

بۆچی لەبرین ئەکۆڵینەوە؟:[٥٧].

١ـ بۆدیاری کردنی جۆری چەك و برین و ئاراستەی لێدان و توندی لێدانەکە.

٢ــ دیــاری کردنــی کــاتی لێــدان و ئــەنجام و ماکــەکانی (المضاعفات).

٣ـ دیاری کردنی ئاستی ترسناکی برینەکە.

٤ـ هەڵسـەنگاندنی ئـەو کـەموکوڕی (العاهـات) و پەککـەوتن (العطل)ـەی لێ‌ی دێتە بەرهەم.

٥ـ دیاری کردنی پەیوەندی نێوان برین و مردنەکە.

٦ـ دۆزینـەوەی پارچەی چەك و تـەنی بێگانە (اجسام غریبـە) لەبرینەکەدا.

چۆن برینەکان تۆمار بکەین؟

١ـ جۆرو شێوەو پانتایی و درێژی و قوڵی و ژمارەیان تۆمار ئەکرێت.

٢ــ شــوێنەکەی لەســەر لــەش، بــەپێ‌ی ناوچــەو زاراوە توێکاریزانی‌یەکان (المصطلحات التشریحیة) دیاری ئەکرێن.

٣ـ درێژی و قوڵی و پانی‌یەکەی بەراستە ئەپێورێت.

٤ـ بۆ ورد بوونەوە لە لێوارو دۆزینەوەی تەنی بێگانە، زەرەبین بەکاردێت.

٥ـ لەزیندوودا، هیچ مەکە بەکونی برینەکان دا، لەلاشەی مردوودا؛ ئەتوانرێت تەلێك بۆ دیاری کردنی قوڵی و ئاراستەی برینەکە بەکار بهێنرێت.

٦ـ ئەگەر کراو ئاشکرا بوو، هۆو چۆنیەتی روودانی برینەکان تۆمار ئەکرێن.

ئەوەی لای دادوەر گرنگە [٥٨]، کاتی روودانو شێوەی دەرەوەو ماکی برینەکەیە، ئەمەش بەپێوانەیەك دائەنرێ بۆ بڕیاری سزادان یان خستنە بری (التعویض)، برین لەم پێودانگە (منطلق)ـەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن ئەکرێت:

١ـ برینی ساکار: کەپاش سارێژبوونەوە، کەم و کوڕی و پەك کەوتن بەجێ نەهێڵێت.

٢ـ برینی ترسناك (الخطرة): ئەو برینەیە کە لە (٢٠) رۆژدا سارێژ نابێت، ئەگەر سارێژ بوو، کەم و کوڕی و پەك کەوتنی لێ ئەکەوێتەوە.

٣ـ برینی کوشندە (القاتلة): ئەو برینەیە، راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ ئەبێتە هۆی مردن.

بەڵام دکتۆر بەپێی جۆرو شانە بڕاوەکان و کاریگەریی و فراوانی و زیان و ماکەکانی پۆلێنیان ئەکات وەك:ـ

١ـ رووشان (السحجة ـ Abrasion Wound)

٢ـ شین بوونەوە (الكدمة ـ Bruise)

٣ـ کوتران (الرضة ـ Lacerated)

٤ـ بڕاوەبرین (الجرح القطعي ـ Incised)

٥ـ پیاکردنە برین (الجرح الطعني stab)

٦ـ ئاژنە برین (الجرح الوخزي Puncture)

٧ـ برینی گوللەو پارچە تەقەمەنی (جروح الطلقات نارية وشظايا المتفجرات ـ Missile)

کەپزیشك بریندارێك ئەپشكنێت، ئەبێت ئەم خاڵانە بەوردی ڕەچاو بكات:

١- ئەبێت جل‌وبەرگی بریندارەكە، هەڵبگیرێت وبپێچرێتەوە

٢- ئەگەر پێویست بوو، وێنەی برین‌و بریندارەكە بگیرێت.

٣- ئەگەر پێویست نەبوو دەست لەبرینەكە نەدرێت، ئەگەر پارچەیەكی لێ كرایەوە، لەشووشەیەكی پڕلە شلەی شانەپارێز (حافظ الانسجة)دا هەڵگیرێت، تا لەكاتی پێویستی‌دا بپشكنرێت.

٤- هەر تەنێكی بێگانە لەبرینەوە دەربهێنرێت، ئەدرێت بەدەزگا بەرپرسەكان.

٥- لەكاتی پێویست دا راوێژ بەپزیشكی شارەزاتر یان پزیشكی دادوەر بكات.

٦- دەرمان و راپۆرت و فایلی نەخۆشێك لەنەخۆشخانەدا بمرێت، ئەنێردرێت بۆ پزیشكی‌ی دادوەری:

هەموو برینێك بەیەكێك لەم ئەنجامانە ئەگات؛

١- یان تەواو سارێژ ئەبێتەوە[٥٩]

٢- یان بەرووكار سارێژ ئەبێتەوە، بەلام پەك كەوتن و كەم‌وكوڕی لێ دەكەوێتەوە.

٣- ئەبێتە هۆی مردنی بریندارەكە.

جگە لەرووشان وشین بوونەوە، هیچ برینێكی تر بەتەواوەتی سارێژ نابێتەوە، (جێ‌زام ـ الندبة ـ Scare) بەجێ ئەهێڵن(٦٠)، یان ئەبنە هۆی كەم و كوڕی و پەك كەوتن، یان ئەبنە هۆی نەمانی كاری ئەندامێك وەك:

ا- كەم‌وكوڕی: جێ‌زامێكی ناشیرین و ناڕێك‌وپێك لەشوێنێكی بەرچاوی لەش دا یان ناڕێككگرتنەوەی شكاوی یان دروست بوونی گەندە جومگە (المفصل الكاذب).

ب ـ پەك كەوتن: وەك ئیفلیجی پەلەكانی خوارەوە پاش شكان، یان لەجێ چوونی بربڕەكانی ناوقەد، كەببنە هۆی پەستاوتن یان برینداری پەتكە دەمار (النخاع الشوكی)

دیاریكردنی ئەم كەموكوڕی و پەككەوتنانە بۆ بڕیاری سزادان یان خستنەبری برینداری‌یەكان گرنگە.

هەندێك برینداری راستەوخۆ برینداركە ئەكوژن وەك[٦١،٦٢،٦٣]

١ـ خوێن بەربوون (خوێنرێژی ـ النزیف)ی ناوەكی یان دەرەكی توند

٢ـ پێكانی ئەندامێكی كاریگەری وەك دڵ یان مێشك

٣ـ لێدانی سیرەمی (الصدمةالكلومیة) وەك سووتاوی، كەزۆربەی زەرداوی خوێن لەلەش ئەڕژێت و ئەبێت بەهەڵم

٤ـ لێدانی دەماری (الصدمة العصبیة) لەئەنجامی ئازارێكی كتوپڕی زۆر توندا ڕاڕەوە دەماری‌یەكان چالاك ئەبنەوەو دڵ ئەوەستێنن.

٥ـ دەمەوانەی هەوایی (الانصمام الهوائی ـ Air Embolism)

لەهەندێك برینی بڕاوو ئاژنی و پیاكردنی مل دا، خوێنهێنەری سەروملی بریندار ئەبێت و هەندێك هەوا لەم برینەوە هەڵئەمژرێتە ناو خوێنەوە، ئەگاتە زكۆڵەی راست (الاذین الایمن) وگیر ئەخوات. گەر هێندی هەواكە زۆر بێت (لە٧٥ سم$^{3}$) زیاتر بێت، بەری ئەو خوێنە ئەگرێت كەئەبێت پەمپ بدرێت بۆ سی‌یەكان، بەمە سووری گچكەی خوێن تێك ئەچێت و دڵ ئەوەستێت[٦٤]

هەروەها لەكاتی تاوانە لەباربردن (الاجهاض الاجرامی)، كەهەوا ئەكرێتە مناڵدانەوە، ئەم هەوایە لەخوێنهێنەرە گەورەو كراوەكانی مناڵدانەوە هەڵئەمژرێت و ئەبێتە هۆی مردن.

هەندێك جار بریندارەكە یەكسەر نامرێت، بەڵكو پاش چەند كاژێرێك یان چەند رۆژێك بەهۆیەك لەمانەی خوارەوە بەهۆی برینەكەیەوە ئەمرێت:ـ

١ـ خوێنرێژی دووەمی توند: ئەمەش لەچەند كاژێرێك یان چەند رۆژێك دا، لەئەنجامی ترازانی مەیینێكی خوێن یان بریندار بوونی بۆری‌یەكی خوێن بەتەڵزمەی ئێسقانێكی شكاوەوە یان جولانی پارچە تەقەمەنی‌یەك، نەخۆشەكە خوێنێكی زۆری لەبەرئەڕوات و ئەمرێت.

٢ـ لێدانی سیرەمی درەنگ: تا(٤٨) كاژێر پاش برینداری‌یەكە، سووتاوەكە یان مرۆڤە پلیشاوە (المهروسه) كە هێندێكی زۆر زەرداوی خوێنی لەكیس ئەچێت و ئەمرێت.

٣ـ چەوری‌یە دەمەوانە (الانصمام الشحمی ـ Fat Embolism): پاش زەبرێكی زۆر، شكاویی ئێسقانێكی گەورە یان كوترانی ناوچە شلەكانی لەش، گۆڕانێك لەخوێن دا ئەبێت، گەردیلە چەوری‌یەكانی ناو خوێن كۆئەبنەوەو كەڵەكە ئەبن و لەگەڵ خوێندا بەهەموو لەشدا بڵاوئەبێتەوە، گەر بەری خوێنی ئەندامێكی یان بەشێك لەئەندامێكی كاریگەری وەك دڵ، مێشك، یان سی‌یەكانی گرت، ئەبنە هۆی مردنی بریندارەكە.

٤ـ خوێن پیس بوون (تسمم الدم ـ Septicemia): برین، كاتی برینداری وپاشتر، لەدەوروبەرەوە بە (میكرۆب ـ خۆرە) پیس ئەبێت. ئەم میكرۆبانە ئەچنە خوێن‌و بەهەموو لەشدا بڵاوئەبنەوەو لەوانەیە ببنە هۆی مردنی بریندارەكە.

٥ـ نەخۆشی‌یە جیاجیاكان: وەك لێدانی دڵی (الجلطه القلبیة) پاش برینداری وزەبر (الشدة) بەركوڵەی سنگ (عظم القص ـ Sternum) بكەوێت. یان هەوی گەدەو دوانزە گرێ كەپێی ئەڵێن (هەوی كیرلینگ) كەلە ئەنجامی زەبری تووندو سووتاوی‌یەوە

سـەرهەڵئەدەن و ئەبنـە هـۆی خوێـنڕێژی توونـدو مردنـی برینداره‌که[٦٥].

سودەکانی لێکۆڵینەوەی برین:

پاش پشکنینی برین، پزیشك ڕووبەڕووی دوو پرسیاری دادوەری ئەبێتەوە، کەتەنیا لەڕێی پشکنینی وردی برینەکانەوە، ئەتوانێ وەڵام بداتەوە[٦٦]:

یەکەم: ئامێری بریندارکەر چی‌یە؟: ئەمەش لەجۆری برینەکەوە ئەدۆزرێتەوە؛

١ـ ئامێری کول: وەك زەوی، مستەکۆڵە و چەکوش ئەبنەهۆی:

ا ـ ڕووشان: کەپەنجەمۆری ئامێر یان ڕووە خشاوەکەی پێوە ئەمێنێت.

ب ـ شین بوونەوە

ج ـ کوتران: لەوانەیە برینەکە پارچەیەکی ئەو ڕووە یان ئەو چەکەی تیا جێ‌مابێت.

٢ـ ئامێری تیژ: وەك چەقۆ، گوێزان، شووشە، خەنجەر، یان نەشتەرگەری ئەبنەهۆی:

ا- بڕاوە بڕین (زامێکی بڕاو).

ب ـ پیاکردنە برین.

٣ـ ئامێری کونکەر: وەك دەرنەفیز، درەوشە، بزمار، دەرزی، دڕك ئەبنەهۆی:

ا ـ ئاژنە برین.

٤ـ کۆسەرە: ئەبێتە هۆی بریندارییەکی بڕاو، کوتراو و لەدووریشەوە وەك تەقەمەنی زیان بەهەناو ئەگەیەنێت.

٥ـ گوللەو پارچە تەقەمەنی: پاشتر بەدوورو درێژی باس ئەکرێن.

دووەم: بارودۆخی ڕووداوەکە چی‌یە و چۆنە؟
ئایا ڕێکـەوت، خۆکـوژی یـان خـەڵك کوژیـە. ئەمـەش زۆرجـار لەشێوەو شوێن و چۆنی‌یەتی برینەکەوە ئاشکرا ئەبێت؛
١- خۆکوشتن: ئاسایی برینەکە، بڕاوە برینە یان پیاکردنە برینە (بەدەگمەن ڕووشان وشین بوونەوە ڕووئەدەن).
ژمـارەی برینـەکان زۆرەو لەیـەك شـوێن دایـە و تونـدی برینـەکان جیاجیـان هەرلـە ڕووشـان تـابرینی کوشـندە. لەناوچـە خۆکوژی‌یـەکانی (بـەرمل،بەرمەچـەك، بەرئانیشـك ولاملووسـەلان (المنطقـة المغبنیـة) دا ئـەبینرێن. ئەمـەش ئـەو شـوێنانەن کەخۆکوژەکە دەستی ئەگاتێ. گەرچی ئەشێت برینەکە تاقانەبێت بەڵام بەزۆری چەند دانەیەکە.
٢- خـەڵك کـوژی: هـەموو جـۆرە (برینێـك) ێکـی تیـا ئـەبینرێت و لەوانەیـە یـەك برینـدار، چـەند جـۆر برینـی بەلەشـەوە بێـت ((هەرلەڕووشانەوە تابرینی کوشندە. بەڵام هەموو برینەکان بەیەك توونـدی و ڕقـەوە دروست ئـەبن. (نـازەبرین ـ برینـداری بـەنازو دوودڵی‌یـەوە) یـان برینـی دوودڵـی (الترددیـة)ی تیانـابینرێت. گەرتـەنیا یـەك بریـن بێت لەوانەیە جیاکردنـەوەی لـە (ڕووداو) یـا (خۆکوژی) گران بێت. تەنیا ئەو برینانە نەبێت کەلە شوێنێکدایە دەسـتی بریندارەکـە خـۆی نـەگاتێ؛ وەك پیاکردنـەبرینێك لەناوەراستی پشتدا کەدەستی خۆی ناگاتێ.
٣ـ ڕووداوڕێکـەوت: هـەمووجۆرە برینـەکانی تیـا ئـەبینرێت، جێ‌برینـەکان هەرەمـەکین. زۆرجـار چـەند کەسـێك لەڕووداوەکـە ئاگادارن. یان برینداری‌یەکە هێندە قورسە، هیچ لەکاری خۆکوژی یان تاوانی خەڵککوژی ناکات؛ وەك ئەوەی ئەبینین یەکێك سەری ئەپلیشـێتەوە یـان پـان ئەبێتـەوە. کەئەمـەی دوایـی زیـاتر لەڕووداوەکانی هاتووچۆدا ئەبینرێت.

پۆلێنی برین:

١ـ رووشـان (السـحجە): بەشـێك لـە سـەرتوێژی پێسـت هەڵئـەماڵرێت[٦٧]، بەیـەکێك لەبرینداری یـە گرنگـەکان دائـەنرێت. چونکـە وەك پەنجـەمۆر[٦٨]. پاشمـاوەی ئـامێرو هـۆی بریندارییەکـەی پێوەئـەمێنێت؛ وەك شوێن تایـەی ماشێن، شـوێن پشـتێن و گوریـس، جـێ چرنوك. هـەندێك رووشـانی تـر گـەرچی پەنجـەمۆری



هۆکـەی پێوەنی یـە، بـەلام بـەهۆی تـەنێکی بێگانـەوە خـۆی ئەناسێنێت؛ وەك رووشانی پاش لەزەوی‌خشان؛ لم‌و خۆڵ لـەناو رووشاوی‌یەکەدا جێ‌ئەمێنێت.

لەبەر ئەوەی ئەم برینە تەنیا سەرتوێژی پێست ئەگرێتەوە، بەترسناك دانانرێت و لەماوەیەکی کەم دا وەك پاشتر باسی ئەکەین، بێ‌ئەوەی پاشماوە (جێ‌زام) وماك بەجێ‌بهێڵێت، سارێژ ئەبێتەوە[٧٠].

جـێ‌چرنوك و خشـانی سـەرجادەو یـان رووشـانێکی درێـژ دروسـت ئەکـەن، گـەرتوانیمان سـەرەتا و کۆتایی‌یەکـەی دیـاری بکەین، وائەتوانین ئاراستەی خشاندنەکە یان چرنوکەکە دیـاری بکـەین. سـەرەتای رووشـانەکە وەك شـوێن دەمـە خاکـەنازی سەرزەوی‌یەك، چاڵێك دروست ئەکات، تابەرەو کۆتایی رووشانەکە بچین، قوڵی‌یەکـەی کـەم ئەبێتـەوە و لەکۆتایی‌یەکـەی‌دا هـەندێك لەسەر توێژەکە بەهەڵکەندراوی وەك چەتر بەجێ دێڵێت[٧١].

هەندێك جار بەشێك لەم رووشانە (سەرتوێژە رووشاوەكە) لەژێر نینۆك دا جێئەمێنێت، بەمە ئەتوانرێت تاوانبار لەنێوان چەند گومانلێكراوێك دا بدۆزرێتەوە، ئەم سەرتوێژە رووشاوە بێگومان خوێنی تیایە، كەئەتوانرێت لەگەڵ خوێنی (رووشاو)ـەكەدا بەراوردبكرێت.

رووشانی سەرلەش زۆرجار شێوەی رووداوەكە دیاری ئەكات، بۆنمونە چەند رووشانێكی ئاراستە جیاجیا، نیشانەی خۆڕاپسكانی رووشاوەكەیە بەدەست رووشێنەرەكەوە. لەوانەیە كۆمەڵە رووشانێكیسەرمل نیشانەی هەوڵی خنكاندنی رووشاوەكە بێت. یان هەوڵی رووشاوەكە بێت كەخۆی لەچنگی رووشێنەرەكە رزگار بكات. رووشانی دەوری دەم ولووت، ئەوە ئەگەیەنێت، یەكێك دەم ولووتی رووشاوەكەی گرتووە وەك بۆ خنكاندنی یان بێدەنگ كردنی یان دەم گرتنی وەك ئەوەی شتێكی دەرخوارد بدات. كۆمەڵە رووشانێك لەسەر یان نزیك ئەندامەدەرەكییەكانی زاووزێ، نیشانەی هەوڵی خۆدەربازكردنە لە (بەزۆر سواربوون ـ الاغتصاب). رووشانی شوێن پەت لە ملدا نیشانەی خنكاندن یان هەوڵی خنكاندنە[٧٢]. پاش مردنیش لەئەنجامی هەڵگرتن و خشاندن و راكێشانی، لاشەكە ئەروشێت.

چۆن ئەم رووشانانە لەوە جیابكەینەوە كەپێش مردن رووی دابێت؟؛

وەڵامەكە ئەوەیە، جگە لەوەی هیچ چالاكە كارلێكردنێكی پێوە نییە، هەروەها رووشانەكە وشكە، بەرەنگ قاوەییە، لێوارەكانی وەك چەرم وایە[٧٣]. بەڵام رووشانی پێش مردن و لەزیندوودا پەمەیی ڕەنگە، قەتماغەیەكی زەردی بەسەرەوەیە، پاش قەتماغەكە سوور ئەبێت و پاش كەوتنی، كەسارێژ بووەوە، بێ هیچ پاشماوەیەك چاك ئەبێتەوە.

رووشان بەپێی ئەم جوداگانانەی خوارەوە، ئەتوانین تەمەنی رووشانەکە واتە کاتی روودانی دیاری بکەین.

| کات | جوداگانەکان |
|---|---|
| بەکاژێر | |
| تا ٢ | زەرداو یان خوێنی لێ دێت و لێ ئەدەڵێت. |
| ٢-٥ | قەتماغەی زەرد، کزر ئەبێتەوە. |
| ٢٤ | قەتماغەی ووشکە. |
| ٢٤-٣٠ | لێواری رووشانەکە بەرز ئەبێتەوە، رەنگی بەرەو تۆخی ئەچێت |
| بەڕۆژ | |
| ٣ | رەنگەکەی تۆخە، سەرتوێژ دەست بەدروست بوونەوە ئەکات[٧٤]. |
| ٧-١٢ | قەراغی سەرتوێژە نوێکە لەپێستە ساغەکە جیا ئەبێتەوە. |
| بەهەفتە | |
| ١-٢ | قەتماغەکە ئەکەوێت، رووپەکی پەمەیی، کەمێك بەرز جێئەهێڵێت. |
| ٣-٤ | رەنگەکەی ئاسایی ئەبێتەوە، بەرزیەکەی نامێنێت و بەتەواوی سارێژ ئەبێتەوە[٧٥]. |

٢- شین بوونەوە (الكدمة)

زەبری کوڵی وەك بۆکس، دار، تێلا، زەوی، دیوار کەبەر لەش ئەکەوێت، بێئەوەی بە [illegible] ریان بەپێست بگەیەنێت(٧٦)، موولوولەکانی خوێنی ژێرپێست تێك ئەشکێنێت، خوێن ئەرژێتە دەوروبەرەکەی[٧٧].

جا بەپێی شل‌وملی ئەو ناوچەیە خوێنەکە لەژێر پێست دا بڵاوئەبێتەوە. ئەم خوێنرێژیەیە، لەگەڵ لاچوونی زەبرەکەدا ناوەستێت، بەڵکو تاماوەیەك هەربەردەوامە[78]. هەندێك جار زەبر راستەوخۆ زیان ئەگەیەنێت، وەك شکانی کەللەسەر، بەڵام ناراستەو خۆ لەشوێنێکی دوور لەشکاوی‌یەکە شین بوونەوە سەرهەڵئەدات. وەك شین بوونەوەی پێڵووی چاو پاش شکانی کەللەسەر (کەللەبۆشایی پێشەوە ـ Anterior Cranial fossa)، یان شین بوونەوەی ئەژنۆ پاش شکاوی ملی ئێسقانی ران[79-80].



قەبارەو بڵاوبوونەوەی شین بوونەوەکە، لەسەر کۆمەڵە هۆکارێك بەندە:

١ـ شل‌وملی ناوچەکە (تاشل‌و مل تربێ، شین بوونەوەکە زۆرتر بڵاوئەبێتەوەو گەورە ئەبێت).

٢ـ کەم و زۆری موولوولەی خوێن لەناوچەکەدا(٨١).

٣ـ هۆی زەبرەکە.

٤ـ هێزی زەبرەکە.

٥ـ تاپێست کاڵتر بێت، شین بوونەوەکە باشتر دەرئەکەوێت. لەگەنم رەنگ دا کەمتر و لە رەش پێست دا هەردەرناکەوێت[82].

٦ـ تەمەن، لەبەرناسکی شانەکانی منداڵ و رەق بوونی خوێنبەرەکانی پیرو پوکانەوەی چەوری ژێر پێست، زووتر موولوولەکانی خوێن تێك ئەشکێن و بڵاوتر شین ئەبێتەوە(٨٣).

٧ـ رەگەز: لەبەر ناسکی و شلوملی ژێر پێستی مێینە، زەبرێکی کەم، شین بوونەوەیەکی فراوان دروست ئەکات.

٨ـ باری تەندروستی: لەم جۆرە نەخۆشییانەدا، زەبرێکی کەم، شینبوونەوەیەکی فراوان دروست ئەکات، وەك نەمەیینی خوێن و نەخۆشی جگەر، ئارەق خۆر و کەموکوڕی ڤیتامین سی (vit c). شین بوونەوە، لەپزیشکیی دادوەریدا گرنگە، ئەم سوودانەی هەیە وەك: خۆی لەخۆیدا نیشانەی زەبرو هێزو توندییە.

ئەگەر لەسەر مل لە شێوەی گوریسێك دا بێت، نیشانەی خنکاندنە. لەسەر کۆم و کیلەك (المهبل) نیشانەی هەوڵی بەزۆر سواربوونە[٨٤]. یان لەوانەیە لەسەر شێوەی نەخشی تایەی ماشێندا بێت، کە نیشانەی بەسەردا رۆیشتنی ماشێنە. ئەگەر شین بوونەوەکە لەمناڵدا ژمارەی زۆرو رەنگی جیاجیا بوو (لەچەند قۆناغێك دا بێت)، ئەوا نیشانەی ئەوەیە کەمناڵەکە بەبەردەوامی سزا ئەدرێت[٨٥].

هەروەها هەندێك جار ئامێری بریندارکەر دەرئەخات وەك:

١ـ قامچی: دووهێڵی هاوتەریب شین بوونەوە دروست ئەکات، لەچالأییەکانی لەشدا ئەبنەوە بەیەك هێڵی شین.

٢ـ دار: ئەمیش دوو هێڵی هاوتەریب شین بوونەوە دروست ئەکات، کەلەچالأییەکانی لەشدا نابینرێت ((دارەکە ناگاتە چالأییەکان[٨٦])).

٣ـ ددان

٤ـ تایەی ماشێن.

جگە لەوەی بەپێی کات، رەنگی شین بوونەوەکە، لەگۆڕان دایە و ئەتوانین هەر رەنگەی بگەڕێنینەوە بۆ ئەو کاتە نزیکەی تیایدا رووی داوە، وەك

| گۆڕانی ڕەنگ | کات |
|---|---|
| | **بەکاژێر** |
| شینی سووربباو (خوێن ئۆکسجینی تیایە(٨٧)) | سەرەتا- ٢- ٣کاژێر |
| | **بەڕۆژ** |
| شین (ئۆکسجینی خوێنەکە هەڵئەمژرێتەوە). | ٣-٤ |
| سەوزی بریسکاوە (هیمۆسیدیرین دروست ئەبێت). | ٣-٧ |
| | **بەهەفتە** |
| زەرد (هیماتۆدین، بیلیڤێردین، بیلیرۆبین[٨٨]) | ١-٢ |
| ڕەنگی ئاسایی پێست. | ٣-٤ |

**٣- کوترلەنەبرین(الجروح الرضية):**

کوتران: بریتی‌یە لەیەك ترازانێکی ناڕێك وپێکی، لێوارخوراوی شانەی پێست[٨٩]، زەبر لەوە زیاترە کەتەنیا رووشان و شین بوونەوەی لێ دروست بێت[٩٠]. ئەم جۆرە برینانە پیسن، تەنی بێگانەی (وەك پارچەی خشت، بۆیە، وردە شوشە هتد) تیایە و لێواری برینەکە خواروخێچە ــ وەك پاش کەوتنە خوارەوە، رووداوی هات‌وچۆ، پیاکێشانی بەرد، خشت. ئەگەر پێستەکە لەسەر شانەکانی ژێر خۆی. بجووڵێت. وەك (لەدەم‌وچاو، پێش لاق، پێستی سەر) دا، ئەوا برینەکە دەم ئەکاتەوە و خوێنی زۆری لێ دێت.



گەر بەووردبین (زەرەبین) سەیری بکەین، ئاشکرایە کەلێوارەکانی ناڕێك و پێکە، شین بوونەوەو رووشانی پێوە دیارە[٩١]، لەوانەیە پارچەی خشت و وردە سیرامیك و بۆیە و پارچە شوشەی تیا ببینرێت، جگە لەوەی جۆری هۆی رووداوەکەمان بۆ دەسنیشان ئەکات، ئەبنە هۆی پیس کردنی برینەکە و سارێژ بوونەوەی دوا ئەخەن[٩٢].

لەتاوانە سێکسی یەکان دا، پەردەی کچێنی و کۆمی (هەتیو) ی هەتیوباز، بەهەمان جۆر (کوترانە برین) بریندار ئەبن[٩٣].

ئەم برینانە پێویستی یان بەنەشتەرگەری هەیەو (٣-٤) هەفتەی ئەوێت تاسارێژ ئەبنەوە، جێ زامێکی ناشیرینی، ناڕێك بەجێ ئەهێڵن. ئەگەر لەناوچە بەرچاوەکاندا بن، ئەوا شێوەی مرۆڤەکە ئەشێوێنن.

٤- براوە برین (الجروح القطعیة)

برینێکی رێك، لێوارڕێك و پاکە[٩٤].

بەهۆی ئامێرێکی وەك: تیغ، گوێزان، خەنجەر، شوشە، قەراغی کاغەزو هەندێك گژوگیاوە دروست ئەبێت[٩٥]. خوێنی لەبرینەکانی تر زیاتر لێ دێت، لەبەر تیژی چەکەکە دەوروبەری برینەکە ناڕووشێ و شین نابێتەوە. بڕینی پێست لەبڕینی هەموو چینەکانی ژێر پێست درێژترە و درێژی یەکەی لەقوڵی یەکەی زیاترە[٩٦]، لەسەرەتاوە زۆر قوڵترە وەك لەکۆتایی یەکەی.

مەترسی یەکانی بەپێی ناوچە برینداڕەکە ئەگۆڕێت:

هەندێك شوێن وەك بەرمل، بەرمەچەك، بەرئانیشك، لامووسەلان، بۆری گەورەی خوێنی رووکار (یەکسەر ژێر پێست)ی تیایەو کەبریندار بوون، خوێنڕێژی یەکی توندی لێ ئەکەوێتەوە، کەژیانی برینداڕەکە ئەخاتە مەترسی یەوە.

باشترین نمونەی، ئەم برینە، برینی نەشتەرگەری‌یە، جگە لە مەترسی خوێنڕێزی و پەك كەوتن و كەم و كوڕی، جێ زامێك بەجێ ئەهێڵێت، كەوەك برینەكە خۆی ڕێك و پێكە و لەبەر پاكی‌یەكەی بەكاتێكی كەمتر لەكوترانە برین سارێژ ئەبێتەوە.

زۆربەی برینە خۆكردەو خۆكوژی‌یەكان لەم جۆرەن، یەكێك لەبرینەخۆكوژی‌یەكان برینی دوودڵی (الجرح الترددی) یە[٩٧]، ئەوەی ئەیەوێت خۆی بكوژێت، لەیەكێك لەناوچەكانی خۆكوژی (وەك بەرمل، بەرمەچەك، بەرئانیشك، لامووسەلان)دا، چەند براوەبرینی جیاجیا، بەقوڵی و توندی جیاجیادروست ئەكات (ئەمەش بەهۆی دوودڵی خۆكوشتنەكەوە).. ئەم برینانە، لەپێش دا رووشان، وردە وردە یان لەپڕدا برینەكە قوڵ ئەكاو خۆی ئەكوژێت. كابرایەكی خۆكوژ (٧٤) برینی دوو دڵی پێوەبوو، ئەمەش هەموو جارێك لەخۆكوشتن دا نابینرێت[٩٨].

برینە خۆكوژی‌یەكان:

بێ ئەوەی ئەو كەسە توێكاری یان پزیشكی‌ی دادوەری خوێندبێتەوە، خۆی لەیەكێك لەم جێگایانەدا[٩٩] دا (بەرمل، بەرمەچەك، بەرئانیشك، لامووسەلان) بریندار ئەكات. ژمارەیەكی زۆر برینی دوودڵی لەپاڵ برینە كوشندەكەوە ئەبینرێت. لەخۆسەربڕین دا برینە كوشندەكە بەچەند برینێكی دوودڵی دەورە دراوە. برینە كوشندەكە لەبەشی سەرەوەی بەرمل، لەو لای ئەو دەستە چەقۆكەی پێ ئەگرێت دەست پێ ئەكات؛ واتە لای چەپ گەر ڕاستەبێت و بە پێچەوانەوەو پاشان بەكەوانەیی بەبەردەم مل دا دێت، بەرەو خوار ئەبێتەوە و پاشان بەرەو لای گوێ (گوێی هەمان لای دەستی چەقۆكەی) ئەهێنرێت. زۆربەیان لەهێڵی ناوەندی مل دا بەپەردەی نێوان ژووری دەنگ و بۆری

هەوادا ئەچن. ئیتر شانەکانی مل هەر لەپێستەوە تا بەر بڕبڕەکانی مل ئەبڕدرێن. لەبەرئەوەی لەم کاتانەدا مل بەپشت دا ئەخرێت، خوێنبەرەکانی سەرمل بەرەو دوواوە ئەترازێن و لەبرینەکە قووتار ئەبن، کەواتە خوێنڕیزیەکە تەنیا لەخوێنهێنەرەکانەوە[100] وە دێت وبریندارەکە وردە وردە لەهۆش خۆی ئەچێت و ئەشێت کەدەمەوانەی هەوا، ببێتە هۆی مردنی[101].

**برینە خەڵك کوژیەکان:**

ئەم برینانە، بەم خاڵانەی خوارەوە لەبرینە خۆکوژیەکان جیا ئەکرێنەوە:

| زنجیرە | برینی خۆکوژی | برینی خەڵك کوژی |
|---|---|---|
| ١ | شوێنەکەی هەڵبژێردراوە | هەرەمەکیە. |
| ٢ | برینی دوو دڵی لەگەڵدایە | لەگەڵی نییە. (گەرسەربڕاوەکە خەوتبێت یان سەرخۆش بێت، ئەوا تەنیا یەك برینە) بەلام ئەگەر بێدار و بەئاگا بێت لەوانەیە سەربڕەکە نەتوانێت بەیەك جار سەری ببڕێت، کەواتە چەند برینێك لەمل دائەبینرێت، ئەم برینانە لەبرینی دوودڵی جیاوازن. |
| ٣ | برینەکە لەهێڵی ناوەندا بەپەردەی نێوان ژووری دەنگو بۆری هەوادا ئەڕوات. | لەم ئاستە بەرزتر یان نزمترە |
| ٤ | لەبەشی سەرەوەی ئەوبەری بەرملەوە دەست پێ ئەکات، بەرەو گوێی | بەهێڵێکی راست دا ئەڕوات |

| | | |
|---|---|---|
| | ئەم بەر دێت | |
| ٥ | وورده وورده قوڵی‌یەکەی کەم ئەبێتەوە | کت‌وپڕ قوڵ ئەبێت |
| ٦ | لەقوڵایی‌دا بەچەند جارێك برینەکە تەواو ئەکرێت. | بەیەکجار ئەکرێت |
| ٧ | بەرەوگوێی ئەم بەردێت | بەرەو دوایان بەرەو خوار ئەخزێت |
| ٨ | برینی خۆپارێزی لەدەست‌وباڵ دانی‌یە | زۆرجار هەیە |
| ٩ | لەوانەیە چەکەکەی لەدەست دا گیربخوات | ناشێت |
| ١٠ | دەستی چەقۆکە زۆرجار لەنێوان دۆشاومژەوئەسپێ کوژەدا بریندار ئەبێت. | ئەودەستەی سەربڕاوەکە بۆخۆپاراستن بەرزی ئەکاتەوە، چەقۆکەبگرێت ولەخۆی‌دوور بخاتەوە: لەناوەراستی لەپی دەست دابریندار ئەبێت،یان لەنێوان پەنجەکان، باڵ مەچەك یان پشت پەنجەکان دا بریندار بێت. |
| ١١ | بەدەگمەن ئەبینین، یەکێك بۆ خۆکوشتن یان لەگەڵ‌خۆکوشتن دا، ئەندامی زاوزێی خۆی بریندار بکات یان ببڕێت | بکوژە سادیزمی‌یەکان: ئەم ئەندامانە بریندارئەکەن یان ئەبڕن، مەمك ئەبڕن، کیسی‌گون بریندار ئەکەن،یان گون لەبن دا ئەبڕن. |

هەندێك کەس بۆتاوانبارکردنی یەکێکی تر یان بۆمۆڵەت وەرگرتن یان خۆدزینەوە لەکارێکی گران، خۆیان لەشوێنێکی بێ‌مەترسی (بەردەست- کەدەستیان بیگاتێ) وەك سەرسنگ، قاچ‌وقۆڵ بریندار ئەکەن. ئەم برینانە سادەو بێ‌زیانن، هەرگیز لەگەڵ ئەو چیرۆکانەدا ناگونجێن کەبریندارەکە دروستی ئەکات.

ئەم برینە کەلەسەرەتادا خوێنی لێ ئەچێت و لەوانەیە دەمی کردبێتەوە، پاش (١-٢) ڕۆژ هەڵئەئاوسێت و سوور ئەبێتەوە (نیشانەی سووتانەوە)ی تیا دەرئەکەوێت و لەدەوروبەری گەرمتر ئەبێت و گەردەستی بەرکەوێت ئازاری دێ.. لەدوو ڕۆژی



تردا ئەم نیشانانە زیاتر ئەبن و قەتماغەیەکی نەرم دروست ئەکات، پاش چوارەم ڕۆژ ریشاڵە شانە دروست ئەبێت و ئیتر برینەکە ناکرێتەوە و پاش هەفتەیەك (جێزام) ێکی پەمەیی بەجێدێڵێت[١٠٢].

٥- پیاکردنە برین (الجرح الطعنی)

برینەکە قوڵییەکەی لەدرێژییەکەی زیاترە[١٠٣]، بەروخسار ساکارو بێوەیە، بەڵام زیانێکی زۆر بەشانە و ئەندامە قوڵەکانی ژێر پێست ئەدات[١٠٤] وخوێنرێژییەکی ناوەکی زۆری لەگەڵ دایە. ئەشێ چەکەکەش؛ کێرد، چەقۆ، خەنجەر، قەمە، یان شمشێر بێت. ئەم برینانە هەمیشە بەتاوانی (خەڵك کوژی) دائەنرێت، بەدەگمەن ڕێکەوت یان خۆکوژییە. ئەگەر خۆکوژی بێت، ئەوا جلەکە (لەبەرئەوەی هەڵئەدرێتەوە) کون نابێت و لەوانەیە برینی دوو دڵی لەگەڵ دا بێت.

جگە لەوەی شوێنی هەڵبژاردنەکەی، لە (پیاوکوژی)یەکان جیایە، بۆنمونە:

کەپیاوکوژێك ئەیەوێت چەقۆیەك یان خەنجەرێك بکات بەدڵی (نێچیرەکە) یدا ئەوا راستەوخۆ لەسەر سنگ لای چەپەوە ئەیکات بەدڵیدا، بەڵام لە خۆکوشتن دا، جل وبەرگەکەی هەڵئەداتەوە (چاڵی سەرگەدە) ی ژێر پەراسووەکان هەڵئەبژرێت، تاچەقۆ یان خەنجەرەکەی پیابکات[١٠٥]



زۆربەدەگمەن، کەوەك سەرگروشتەی لێ دێت، ئەشێت بەرووداوێکی رێکەوت، نەك تاوانی شتی وا رووبدات، وەك ئەوەی[١٠٦] خوشکێك لەسەرمێزی نان خواردن چەقۆیەك بەهەڵدان ئەدات بەخوشکەکەی کەبەرامبەری دانیشتووە، بەڵام چەقۆکە ئەچێت بەسەر دڵی داو ئەیکوژێت.

کاتێك چەقۆیەك یان ئامێرێکی تر بەلەشدا ئەکرێت، شانەکان لەبەر ئامێرە تیژەکەوە ئەکشێن و پاش دەرهێنانەوەی ئامێرەکە ئەچنەوە یەك، لەبەر ئەمە ناتوانرێت کەقەبارەی برینەکە بەقەبارەی راستەقینەی چەکەکە دابنرێت.

هەروەها، لەبەر ئەوەی چەکەکان زۆربەی لەیەك ئەچن و تیژن، ناتوانرێت جۆری چەکەکە دیاری بکرێت. ئەو کەم جارە نەبێت کەچەکەکە لەبرینەکەدا ئەشکێت و پارچەیەکی تیا بەجێ ئەمێنێت. بەڵام ئەتوانرێت ئەوە بووترێت کە برینەکە (پیاکردنە برینە). لایەك یان هەردوولای چەکەکە تیژە، ئەمیش لەوەوە دەرئەکەوێت کە لاتیژەکە، بەتیژیورێکی شانەکان ئەبڕێت، بەڵام

لـە لاکولەکـەوە، برینەکـە کولـە، کوتـران و شـینبوونەوەی تیـا ئەبینرێت.

٧ـ ئاژنەبرین (الجرح الوخزي)

لەپێســتدا برینێکــی هێنــدە بچــووك دروســت ئــەکات، کەنەخۆشەکە، بگرە هـەندێك جار دکتۆریـش فەرامۆشی ئەکات و هیـچ گرنگـی پێنـادات. بـەڵام زیـانێکی زۆر بەشـانە قوڵـەکان ئەگەیەنێت.

چەکی برینداریەکە ئەشێت تیـژ وەك دەرزی، دڕك، درەوشـە یان نیوەتیژ (نیمچە تیژ) بێت وەك دەرنەفیز، یان تەنیا سەرەکەی تیژ بێت وەك دەمە مقەست.

بەم پێیە گەر چەکەکە وەك دەرزی تیـژ بێـت و تیرەکـەی کـەم بێت ئەوا پاش ماوەیەکی کەم شوێن برینەکە دیار نامێنێت، بەڵام تاکولتر بێت ئەوە لێواری برینەکە نارێك و پێك ئەبێت و ئەشێت بازنە یان کەوانەیەك شین بوونەوە لەدەوری برینەکە بەجێبهێڵێت.

٧ـ برینی تەورو قیمەکێش:

ئەمانە جوداگانەی دوو ئامێریان تیایە وەك (کوتران) و (بڕین). کوترانەکە بەهۆی قورسـی ئامێرەکـەو بڕینەکـەش بـەهۆی تیـژی (لێوار)ی[١٠٧] دەمەکەیەوە، بەچاو برینەکە بە (بڕاوە برین ـ الجرح القطعي) دائەنرێت. بەڵام ئەگـەر بـەزەرەبین سـەیر بکرێـت، ئـەوا لێوارەکـەی خواروخێـچ و نارێکـە، ژێـر پێســت شـین ئەبێتـەوەو خوێنی تێئەزێت.

گەرئەم ئامێرە قورسانە بەرئێسقان بکەون، لەوانەیە بیشکێنن، گەرچی زۆربەی ئەم برینە (خەڵك کوژی ـ تاوان)ییە، بەڵام ئەشێت بەرێکەوت خاوەن پیشە جیاجیاکان خۆیان بەم ئامێرانە بریندار بکـەن وەك قیمەکێشـی گۆشــت فـرۆش یــان تــەوری داربــڕ، کەلەدەستیان ترازا، ئەشێت رانی خۆیانی پێ بریندار بکەن.

### ٨- برینی کۆسەرە

ئەم ئامێرە لەدارتاشی و ئاسنگەریدا بەکاردێت، وریایی و هێزی ئەوێت، تابتوانرێت بەرێكوپێكی وبێ وەی بەکاربێت. هەندێك جار بەرێکەوت لەدەستی وەستا یان شاگردەکانی ئەترازێت و سك یان باڵ بەتووندی بریندار ئەکات. برینەکە لەشێوەی کوتران و ونجر ونجر بوون دایە. جوداگانەیەکی ئەم برینداری‌یە ئەوەیە کەلە گوللەو پارچە تەقەمەنی ئەچێت. ئەویش بەوەی (هێزی بۆشایی دروست کردنی) هەیە و شەپۆلەکەی زیان لەهەناو ئەدات. تەنانەت ئەگەر هەناوەکە لەبرینەکەشەوە دووربێت. ئەو هەناوانەی زیاتر زیانیان پێ ئەگات؛ گەدەو ریخۆڵەن کەگژوگازی تیایە. دوورنی‌یە جگە لەتەقاندنی ئەم هەناوانە، خوێنی ناو بۆریچکەکانی خوێنیان بمەیەنێت.

لەنەخۆشخانەی فێرکاری موسڵ بووم، کرێکارێکی کوردیان هێنا، هاوکارێکم ئەوشەوە ئێشکچی نەشتەرگەری‌بوو، کەبرینی کۆسەرەکەی لەسەر سکی نەخۆشەکە دی، لەژێر بەنجدا برینەکەی پشکنی، بۆی دەرکەوت کەهێشتا برینەکە نەگەیشتۆتە پەردەی هەناوپۆش (پەریتۆن). لەبەرئەمە نەخۆشەکەی بێ‌نەشتەرکاری هێشتەوە، رۆژی دوایی باری گشتی نەخۆشەکە، بەرەو تێکچوون ئەچوو، تالەپڕ مرد. پاش لاشە توێکاری (تشريح الجثة) لەلایەن پزیشکی پسپۆری دادوەری‌یەوە؛ دەرکەوت کەهێزی سوڕانی کۆسەرەکە وەك تەقەمەنی، بووە بەهۆی تەقینی ریخۆڵەکان و رەش بوونەوەی هەندێکی تری.

لێرەش لەسلیمانی، لەنەخۆشخانەی فێرکاری، باوکی مامۆستایەکی زانکۆ کەدارتاش بوو، کۆسەرە بەرسکی بریندار کردبوو. بەرووکار برینداری‌یەکەی ساکار و تەنیا شین بوونەوەو رووشانی دیواری سك بوو. کەداوامان لەنەشتەرگەری ئێشکچی

ئـەو رۆژە کـرد، لەبـەر رۆشـــنایی رووداوەکـــەی نەخۆشـــخانەی فێرکاری موسڵدا، ســکی بکاتــەوە، کردی‌یــەوە، دیمـان کەچـەند بۆریـەکی خوێنـی ریخۆڵـە و ریخۆڵـەی لەچـەند لایەکـەوە بریـنـدار بووە

* * *

## برینی گوللەو تەقەمەنی

ئەو برینانەن بەهۆی گوللەی کانزایی و پارچەی تەقەمەنییەوە لەلەش دا دروست ئەبن. تا باشتر لەم برینانە بگەین و بەئاسانی بیان ناسینەوە، واچاکە باسێکی خێرای ئەم جۆرە چەکە ئاگریانە بکەین.

چەکی ئاگری: ئەوچەکانەیە کەبەهۆی سووتانی باروتەوە لەئەنجامی پاڵنانی گوللە کانزایییەکان بەخێرایی دەرئەپەڕێنێتە نێچیر یان نیشانەکەی.

بەگشتیئەم چەکانە لەسێ بەش پێك دێن:

یەکەم: لوولەی چەك (السبطانة ـ Barrel):

لوولەیەکی کانزایی بۆشە، لەپێشەوە کراوەیەو لەپشتەوە بەکۆگەی فیشەکەوە بەندە. ئەم کۆگەیە یان جێگیرە یان بزێوە. بەپێی ئەم لوولەیەو شێوەی ناوەوەی لوولەکە چەکەکان دوو چەشنن(١٠٨):

١ـ لوولەی ناومیلدار: وەك تفەنگ و دەمانچە.




٢ـ لوولەی ناولووس: وەك تاپڕ.

بـەپێی درێـژی ئـەم لوولـە ناومیلدارانـە،چەكـەكان دوو جۆرن، وەك:



١ـ لوولە كورت (یەك تا ١٢ گرێ) وەك دەمانچە

٢ـ لوولـە درێـژ (٢-٣ پێ) وەك تفەنگ[١٠٩]

١ـلوولەی نـاومیلدار:

ئەم میلانە دوو بەشن چاڵ وبەرز (سدود و خدود)، هـەرمیلێكی بەرز بەدوو میلی چاڵ خول دراوە، ئەم میلانە تا دەمی لوولەكە بەردەوامن و پێچاو پێچن و ناوبۆرییەكە ئەنەخشێنن. ئەم میلانە بۆچەند مەبەستێك لەم لوولانەدا دروست ئەكرێن؛

ا ـ گوللـە تەقێنراوەكـە، بـەهۆی ئـەم میلـە بـەرزو چـاڵ وبەردەوامەوە، لەگەڵ ناولوولەكەدا چەسپ ئەبن و بەمە ناهێڵێت، گژوگازی تەقینەوەكە لە تەنیشت گوللەكەوە، دەرپـەڕێت. بـەڵكو پاڵ بەگوللەكەوە ئەنێت وتەوژمی ئەداتێ.

ب ـ گوللـە لـەناو ئـەم میلانـەدا ئەخولێتـەوە، خێرائـەبێت. تالوولەو میلەكان درێژتر بن، خێرایی گوللەكە زیاترەو وزەكـەی بەرزترە، بۆ نمونە:

لەلوولـە كـورت دا، وەك دەمانچـە، خـێرایی گوللەكـە (٤٠٠مـەتر/چركـە)[١١٠] یەكـەو نزیكـەی (٣٥٠-٥٠٠مـەتر) بڕئەكات[١١١].

لەلوولـە درێـژدا، وەك تفـەنگ، خـێرایی گوللەكـە (١٠٠٠مـەتر/چركـە)[١١٢] یەكـەو نزیكـەی (٢٠٠٠-٣٠٠٠مـەتر) بڕئەكات)[١١٣].

ج - ئەم خولانەوەو خێراییەیە وا لەگوللەکە ئەکات، بەهێڵێکی ڕاست دەرپەڕێت و تابڕ ئەکات، نیشانە بپێکێت.

د- دووری نێوان میلە بەرزەکان، (نمرە- عیار)ی چەکەکە دیاری ئەکات، بۆ نمونە ئەگەر دووری نێوان (تیرە)ی چەکەکە (٧ملم)ـە. هەروەها (١١،٩.... هتد).لێرەدا ئەبێت ئەوە بڵێین، کە (نمرە)کە نزیك کردنەوەیەکی تیایە.

بۆنمونە:

ئەگەر تیرەی نێوان ئەم میلە بەرزانە (٦،٥ملم) زیاترو (٧،٥ملم) کەمتر بوو، ئەوا هەر بە (٧ملم) دائەنرێت.

تانمرەی چەکەکە بەرزتر بێت، تیرەی لوولەکەی گەورەتر ئەبێت و خێرایی گوللەکە کەمتر ئەبێتەوە.

٢ــ لوولــەی نــاولووس: ناولوولەکــە لووســەو هیــچ میلێکــی تیانییە، لوولەکە تابەرەو پێشەوە بڕوا تەسك ئەبێتەوە خێرایی گوللەکەی کەمترەو تەنیا (٥٠م) بڕئەکات[١١٤].



نمرەی ئەم چەکانە، کەباشـترین نموونــەی تاپڕە، بەپێی ژمارەی (دەنکــــــــــــــــە قورقوشمەکانی) نــاوی دیــاری ئــەکرێت؛ بــۆ نمونە: ئەگەر فیشەکی تاپڕەکە (١٢)دەنك قورقوشمی تیابوو، ئەوا (نمرە- عیار) ەکەی (١٢)ـەیە.

بارستەی ئەم دەنکە قورقوشمانە لەهەموو جۆرە تاپڕەکان دا جێگرە، بەم شێوەیە تاژمارەی دەنکەکە زیاتر بێت، ئەوا کێشی دەنکەکان کەمتر و بچووکترەو بەپێچەوانەوە. هەروەها تاژمارەی

دەنکەکان و نمرەکە زیاتر بێت، ئەوا تیرەی لوولەکەی کەم واتە تەسکترە، گەورەترین لووله، تاپڕی نمرە(٨) ە.

دووەم: بەشی تەقاندن (جهاز الاطلاق - Shotting Part)

لەکۆمەڵێك زەمبەلەك و بۆری بزوێن و بەشی نەبزووت پێك هاتووە. فیشەکەکە لە (تۆپ) یان (شانە)کەوە ئەهێنێتە کۆگەی فیشەك و ئەیباتە بەرلوولەکەو ئامادەی ئەکات بۆ تەقاندن. کەپەنجە بەپەلەپیتکەدا نرا چەکوشەکە بەدەرزییەکەیەوە ئەدات بەناوەڕاستی کەبسولی بنی قاوغی فیشەکەکەداو ئەتەقێت.

لەزۆر چەك دا خۆبەخۆ قاوغی فیشەکەکە، لەلایەکەوە دەرئەپەڕێتە[115] دەرەوەو لەدووری چەند مەترێك ئەکەوێت. لەهەندێکیان دا پێویستی بە (میل هێنانەوە) هەیە تاقاوغی فیشەکەکە هەڵبدات و فیشەکێکی تر بباتە پێشەوە. ئەم چەکانە (زامن ـ بسمارالامان ـLock)یان هەیە، ئەمەش بزمارێکە ڕێلەدابەزینی چەکوش و جوڵانی دەرزییەکە ئەگرێت. لەکاتی بەکارنەهێنانی چەکەکەدا وای لێ ئەکات، گەر پەنجەش بە پەلەپیتکەکەیدا بنرێت، ناتەقێت.

سێیەم: فیشەك

هەرچەکەو جۆرە فیشەکێکی هەیە، بەئاسانی لەیەکتر جیا ئەکرێنەوە، گەرچی هەموویان لەم بەشانەی خوارەوە پێك دێن:

١ـ گولله: لەشێوەی بەڕوودایە، بەزۆری لەقورقوشم دروست ئەکرێت، هەندێك جار کرۆکەکەی قورقوشمەو توێکڵەکەی (مس) یان (نیکل) یان ئاسن و بەمس یان (نیکل) زەرکەف کراوە.



گولله کەمێك لەبۆشایی ناو لوولەی چەکەکە گەورەتر، ئەمەش بەو مەبەستەی گولله تەقاوەکە لەلولەکەدا بەچەسپی دەرچێت و ڕێ نەبێت بۆ گڕوگاز لەتەنیشتییەوە دزەبکەن.

کەئەڵێن ئەم چەکە گوللەی (300 .0) گرێ، ئەتەقێنێت، ئەوا تیرەی ناو لوولەکەی (300 .0) گرێیە، بەلام تیرەی گوللەکەی (.0 308) گرێیە.

میلی بەرزوچاڵی لوولەی میلدار، پەنجەمۆری خۆیان لەسەر



تەنگەی گولله تەقاوەکە بەجێ ئەهێڵن و ئەمەش ناسینەوەی ئەوچەکە ئاسان ئەکات کەگوللەکەی لێوە تەقێنراوە.

لەتاپڕدا: گوللەکان بریتین لەدەنکە قورقوشمەکان کەتیرەی هەریەکەیان (١,٢٢–٥)ملم ئەبێت و هەر دەنکە قورقوشمێك نمرەیەکی هەیە کەیەکسانە بەتیرەکەی، و بەبەربەستێکی تەپەدۆر یان نایلۆن یان لباد لەباروتەکە جیاکراونەتەوە.

٢ـ باروت: مادەیەکی زوو گڕگرتووە، لەگەڵ سووتان دا هێندێکی زۆرگڕوگاز دروست ئەکات. باروت دووجۆری هەیە:

أ ـ باروتی بێدوکەڵ: ئێستا ئەم جۆرە بەکار ئەهێنرێت و بریتییە لە (نایترۆسلیلۆز) و (نایترۆگلیسرین)، لەبڵەیەکی کانزاییدا لەگەڵ گرانیت تێکەڵ ئەکرێن و ڕەنگەکەی ئەبێت بەخۆڵە مێشی.

هەریەك (گم) لەگەڵ سووتان دا ($١٠٠٠سم^٣$) گازی (هایدرۆجین، نایترۆجین، کاربۆن مۆنۆکساید وکاربۆن دایۆکساید) دروست ئەکات[١١٦].

ب ـ بارووتی دوکەڵاوی: لەپۆتاسیۆم نایترەیت و گوگردو کاربۆن، پێك دێت، ئێستا بەدەگمەن بەکاردێت، لەگەڵ سووتان دا یەك (گم) لەم بارووتە (۲۰۰-۳۰۰سم^۳) گازی (هایدرۆجین، نایترۆجین وکاربۆن مۆنۆکساید، کاربۆن دایۆکساید و گۆگردی هایدرۆجین) دروست ئەکات و لەپاشماوەی سووتانەکەیدا کاربۆنێکی زۆری لێ ئەمێنێتەوە.

۳ـ قاوغ (الظرف)

لەچەکە میلدارەکاندا، لوولەیەکی کانزایی‌یە لەسەرێکەوە کراوەیە تا گوللەکەی تێ‌بخرێت. لەناوەراستی ژێرەکەیدا (کەبسول)ێکی هەیە، کەوەك (شقارتە) وایە، کەدەرزی‌یەکەی بەر ئەکەوێت، گڕئەگرێت و ئەبێتە هۆی سووتانی بارووتەکە. ئەم قاوغە لە تێکەڵەی (زینك ـ۳۰٪، مس ـ ۷۰٪) یان لەمس ونیکل دروست ئەکرێت، قاوغی فیشەکی تاپڕ مقەبایە.

٤ـ کەبسول: دوگمەیەکی کانزایی‌یە، بارووتی تیایە. کەدەرزی‌یەکەی بەرئەکەوێت کڵپە ئەکات و لەرێی چەند کونێکەوە گڕەکەی ئەگاتە بارووتی ناو قاوغەکە و ئەیسوتێنێت. گڕوگازی ئەم سووتانەیە گوللەکە دەرئەپەڕێنێت.

بڕینی گوللە و تەقەمەنی:

جۆروفراوانی بڕینەکە لەسەر ئەو وزەیە بەندە کە (تەقێنراوەکەـ Missile) لە کاتی بریندار کردنەکەدا هەیەتی:

هێندی وزە = ½ بارستایی × (خ یەك^۲ـ خ دوو^۲)

خ یەك = بریتی‌یە لەخێرایی چوونە ناو

خ دوو = بریتی‌یە لەخێرایی لێدەرچوون یان جێگیر بوون

لێرەدا بەڕوونی پەیوەندیی هێندی وزە تەقێنراوەکە بەخێرایی‌یەکەیەوە دەرئەکەوێت. تاخێرایی‌یەکەی زیاتر بێت وزەی زیاندەرو تێکشکێنەر زیاتر ئەبێت. لێرەدا ئەوەمان بۆ

دەرئەکەوێت، کەدوور ونزیکی چەکەکە لەلەشەوە، پەیوەندی هەیە بەهێندی وزە و زیانەکەوە، چونکە تانزیکتر بێت، بەخێرایی‌یەکی زیاترەوە ئەچێتە ئەو بەشەی لەشەوەو زیانەکەی زیاترە.

بۆ نمونە: لوولە کورتەکانی وەك دەمانچە بەخێرایی (٤٠٠مەتر/چرکە) یەك ئەتەقێن.

لوولە درێژەکانی وەك تفەنگ بەخێرایی (١٠٠٠مەتر/چرکە) یەك ئەتەقێن.

پارچە تەقەمەنی بەخێرایی زیاد لە (٢٠٠٠مەتر/چرکە) یەك دائەڕۆن.

نموونەیەك:

ئەشێت کەگوللە تفەنگێك لەدووری (٢٠٠٠مەتر) دا، بەخێرایی (٢٠٠مەتر/چرکە) یەك دا بەرلەش بکەوێت، بێگومان وزەکەی کەمترە لەو گوللە دەمانچەیەی لەدووری (٢٠مەتر)دا بەخێرایی (٣٥٠مەتر/چرکە)یەك دا بەرلەش ئەکەوێت.

گوللە دەمانچە جگە لە تێکشکاندنی شانەی ئەو بەشەی لەش کە بەری ئەکەوێت لەڕاڕەوی تێپەڕینەکەیدا زیانی تری نی‌یە. بەڵام گوللەی تفەنگ و پارچەتەقەمەنی جگە لە(زیانی ڕاڕەوی)، زیانی تری هەیە کە پێی ئەڵێن (بۆشایی کاتی ـ التجويف التخريبي ـ Temporary Cavitatian) ئەمەش بریتی‌یە لەوەی بۆشایی‌یەك لەدەوری ڕاڕەوی گوللەکە، دروست ئەبێت، شانەکانی دەوروبەری ئەپەسێوێت، بۆری خوێن و دەمارەکان ئەجەرێنێت و برینداریان ئەکات و بەتێپەڕینی گوللەکە بۆشایی‌یەکە ئەچێتەوە یەك و نامێنێت.

کاریگەری ئەم (بۆشایی‌یە کاتی)یە تا دووریەك ئەڕوات (٣٠جار) هێندەی تیرەی گوللەکەیە[١١٧].

تاخێرایی گوللەکە کەمتر بێت وزەی برینی شانەکانی کەمتر نەبێت و زیانەکانی کەم ئەبێتەوە، بەم پێیەش دووجۆر برینمان هەیە:

١ـ گوللەی تیا ئەمێنێت: جگە لەخێرایی وزەی گوللەکە، رەوتی گوللەکە لەسەر جۆرو پتەوی ئەو شانەیە بەندە کەپیاتێئەپەڕێت. شانە پتەوەکانی وەك ماسوولکە، ئێسك، گەرچی زیانی زۆریان پێئەکەوێت، بەڵام والەگوللەکە ئەکەن لەلەش دا بمێنێتەوە و لەم برینانەدا تەنیا (کونی پیاچوون ـ فتحە الدخول ـ Inlet) ئەبینرێت و (کونی دەرچوون ـ فتحە الخروج ـ Exit)ی نیيە.

ئەگەر لەم برینداری‌یانەدا ئێسك شکا، ئەشێت پارچە ئێسکەکان وزە و تین وەرگرن و وەك پارچە تەقەمەنی رەفتار بکەن و زیان بگەیەنن.

٢ـ گوللەی کوناودەر: ئەگەر گوللەکە خێرابوو، کەبەر لەش ئەکەوێت ئەوا لەبەرامبەر خۆیدا لەلەش دەرئەچێت، بەم شێوەیە (کونی پیاچوون و دەرچوون) ی ئەبێت.

بێگومان ئەم برینە کوناودەرانە زۆر سەختترن، چونکە خێرایی گوللەکە زیاترە و بەمە وزەو هێزی تێکشکاندنی زیاترە وەك لەو برینانەی گوللەی تیا ئەمێنێتەوە[١١٨].

لێکۆڵینەوەی برینەکان

کونی پیاچوون: پێکانە برین: پیاچوونە برین: فتحە الدخول: بەپێی‌دوورو نزیکی‌و (نمرە)ی گوللەکە ئەگۆڕێت:

١ـ لوولەی چەکەکە لەسەر پێست بێت لەکاتی تەقاندنەکەدا: برینێك دروست ئەبێت لەشێوەی قڵیش یان (کۆ +)دا ئەبێت. لێوارەکانی نارێك و پێك[١١٩]. پربەلوولەی چەکەکە رەنگی باررووتی نیمچە سووتاو ئەگرێت (وشم بارودی) شانەکانی ژێر پێست شین ئەبنەوە و خوێنیان تێئەزێت. لەئەنجامی ئەو گازانەی

ئەچنـــە نـــاو برینەکـــەوە (وەك کـــاربۆن مۆنۆکســـاید)، رەنگـــی خوێنتێزانەکـــە ســـورێکی کـــاڵ ئـــەبێت. لەوانەیـــە لـــە تـــەکانی چەکەکەوە، لوولەکەی بچەقێتە سەر پێست و بازنەیەکی کوتـران دروست بکات (الحلقه الرضية)[١٢٠]. ئەم بازنەیە یان بازنەی تەواو



یان هێلکەیی‌یە، ئەگەر شاقوڵی لوولەکە لەسەرپێست دانرا، ئەوا بازنەیی ئەبێت، بەڵام ئەگەر کەمێك بەخواری دانرا ئەوا هێلکەیی ئەبێت. لاکەی تری فراوانتر ئـەبێت و ئەولایـەی کەبەپێستـەوەیە بچوکتر ئەبێت. بەمە ئەتوانرێت ئاراستەی دانانی لوولەی چەکەکە بزانرێت[١٢١].

٢ـ گوللەی نزیك (١٥سم تا سێ‌پێ)

برینەکە قڵیشێکە، رەنگی باروتی (وشم بـارودی) لـەدەورە، جگە لەوەی گڕی ئاوەڵی گوللەکە پێستـەکە ئەسـوتێنێت (حـرق بارودي)[١٢٢]. برینەخۆکوژی‌یەکان زۆربەی لەم جۆرەن[١٢٣].

٣ـ تەقەی دوور: لە (سێ‌پێ) یان (یاردە)یەك دوورتر بێت، لـەم دووری‌یەوە تا (٥٥مەتر) لەدەمانچەو (١٨٠مەتر)[١٢٤] لەتفەنگ دا برینەکە هەمان شێوەو جوداگانەی هەیە، خڕن، لێواری پێستەکە بەناودا ئەچێت، سەرتوێژی پێستی لێوارەکەی هەڵئەماڵرێت[١٢٥].

لەبەر ئەوەی بارووت و گڕەکەی ناگاتێ، ئیتر سووتان و ڕەنگی بارووتی لەدەور نابینرێت.

کونی دەرچوون: کونی لێ دەرچوون (فتحە الخروج)

بازنەی کوتران، سووتانی بارووتی و ڕەنگی بارووتی لە دەور نی‌یە، تەنیا برینێکە لەشێوەی (کون) ێکدایە لەپێست دا لێوارو هەڵقڵیشانی کونەکە لەسەر ئەم خاڵانە بەندە[١٢٦]:



١- خێرایی گوللەکە.

٢- ئاراستەکەی، ئایا بەنووک، لار، یان پاشوڵدا لەلەش دەرئەچێت.

٣- ئایا هیچ پارچە ئێسکێکی لەگەڵ خۆی هێناوە یان نەء. خێرایی گوللەکە[١٢٧] لەلەشدا وردە وردە کەم ئەبێتەوە، بۆیە لێوارەکانی نارێکوپێکە و بەرەو دەرەوە هەڵئەپچڕێن.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم برینانە لەپیاچوونە برین بچوکترن. مەگەر گوللەکە بەلادا هاتبێتە دەرەوە یان پارچە ئێسقانێکی لەگەڵ خۆی هێنابێت و برینەکەی هەڵقڵیشان بێت.

ئەگەر گوللەکە لەدوورەوە هاتبێت، ئەوا ئەم برینە زۆر لەبرینی پیاچوون ئەچێت و لەتیرەدا یەکسان ئەبن.

رەوتی گولله لە لەشدا

لەپیاچوونـە برینــەوە بــەهێڵێکی راســت ئــەڕوات، تائەگاتــە شانەیەکی پتەوی وەك ئێسك، لێرەدا یـەکێك لەمانەی خوارەوەی بەسەردا دێت:

١ـ ئێسـکەکە ئەشـکێنێت یـان پارچەیـەکی لێ ئەکاتـەوە، ئـەم پارچەیـەش تـینو وزە و گـوڕ وەرئــەگرێت و وەك پارچــە رەفتــار ئەکات.

٢ـ خوار ئەبێتەوە، ئاراستەکەی ئەگۆڕێت.

٣ـ توێکڵی گوللەکە پارچەپارچە ئەبێت و بەئاراستەی جیاجیا بڵاو ئەبێتەوەو زیانێکی زۆر لەشانەکانی لەش ئەدات.

برینــی تــاپڕ: بڵاوتریــن جــۆری تــاپڕ نمــرە (١٢) ەیــە[١٢٨].

پیاچوونە برینێکی تایبەتی هەیە، بەڵام زۆر بەدەگمـەن دەرچوونـە برینی هەیە. پیاچوونە برینەکە لەسەر لەش کونێکی خڕە، بەپێی دوورو نزیکی لە لەشەوە، پیاچوونە برینەکە ئەگۆڕێت:

١ـ لوولەکە لەسـەر پێســت بێـت: برینـە سـەرەکییەکە دیـارە، خـڕە، گەورەیـە (یـەك گـرێ) ئـەبێت، بـەڵام برینــی شـوێن دەنکـە قورقوشمــەکان دیـارنین، جگـە لـەم قورقوشمانـە، ئـەوا بــارووتو قەپاغی کارتۆنی سەرەڤیشەکەی تیا ئەبینرێت. ئەگەر خۆکوژی بوو، لەسەردا بوو ئەوا بەرامبەر خۆی کەللەسەر هەڵئەتەکێنێت.

٢ــ لەنزیکــەوە (تایاردەیــەك)؛ لەوانەیــە ســەر بپژێنێــت[١٢٩]. لەشــوێنی تــردا وەك یــەك بارســتە ئەچێتــە ژوورەوەو کونێکــی هێلکەیی یان خڕدروست ئەکات، لێوارەکانی کەمێك خواروخێچەو دەوروبەرەکـەی رەش ئەبێتـەوەو مـووی ناوچەکـە ئەسـووتێنێت و پارچەی سەری ڤیشەکەکەی تیا ئەبینرێت.

٣ـ لـەدوورەوە (لەیاردیـەك تا چـوار یـاردە)، دیسـان وەك یــەك بارستە ئەچێتە لەشـەوە. بـەڵام دەنکە قورقوشـم لەبارسـتەکە جیـا

ئەبێتەوەو لە دەوری برینە سەرەکی‌یەکە برینی بچوک بچوکی (٨/١) گری‌یی دروست ئەبێت:
بەچاو، لەوانەیە پارچەی سەرە فیشەکەکەی تیائەبینرێت، بەڵام پیسی و بارووتی تیانابینرێت. ئەگەر (سڕین ـ مسحە) یێکی لێ وەرگیرا، ئەم پیسی‌و بارووتەی تیا ئەبینرێت.
تادوورتر بێت، دەنکە قورقوشمی زیاتری لێ جیا ئەبێتەوە، لە (١٠) یاردەدا برینە سەرەکی‌یەکە نامێنێت و تەنیا برینی دەنکە قورقوشمەکان ئەبینرێت، ئەم جۆرە برینانە کوشندە نین، تەنیا مەگەر بەربۆری‌یەکی خوێن یان بەر ئەندامێکی کاریگەر بکەوێت.
بەپێوانی دووری نێوان دوورترین دوودەنکە قورقوشم، ئەتوانرێت دووری تەقەکە بەم هاوکێشەیەی خوارەوە دەربهێنرێت:
دووری تەقەکە بە (یاردە) - (دوری نێوان دوورترین دوودەنکە قورقوشمەکە بەگرێ) —١
بۆنموونە: ئەگەر دووری نێوان دوورترین دوودەنك (٦گرێ) بوو ئەوا دووری تەقەکە بەیاردە - (٦) — (١) - ٥ یاردە.
جۆری ڕووداوەکە
پاش برینی گوللەو تەقەمەنی، پزیشك بەرەو ڕووی چەند پرسیارێك ئەبێتەوە:
١ـ جۆری چەکەکە چی‌یە؟
٢ـ لەچ دووری‌یەکەوە بریندار کراوە؟
٣ـ ئاراستەی تەقەکە چی‌یە؟
٤ـ ئایا خۆکردە، پیاوکوژی‌یە، ڕووداوو ڕێکەوتە؟
٥ـ هۆی ڕاستەقینەی مردنەکە چی‌یە (ئەگەر لاشەی مردووی پشکنی)؟

*جۆری چەکەکە، لەدەرهێنانی گوللەکەوە، دیاری ئەکرێت. بەڵام ئەگەر گوللەکە کوناودەر بوو، یان نەدۆزرایەوە، ئەوا تەنیا ئەوەندە ئەووترێت کە برینەکە دەرەنجامی گوللەی چەکێکی ئاگرییە. ئەگەر گوللەکە دەرنەچوو بوو، پاش لاشە توێکاری نەدۆزرایەوە؛ ئەوا ئەتوانرێت، ئێکسبەرداری (الاشعه X-ray)بۆلاشەکە بگیرێت و گوللەکە لەفیلمی ئێکسبەرداریدا دەرئەکەوێت و جۆری چەکەکەی پێ ئەناسرێتەوە.

دووری تەقەکە، لەبوون و نەبوونی (بازنەی کوتران، کوتران و خوێن تێزان و .... هتد) دیاری ئەکرێت وەك لەخوارەوە روونی ئەکەینەوە:

١ـ لوولەکە لەسەر پێست:

بازنەی کوتران

سووتانی بارووتی

نەخشی بارووتی

شین بوونەوەو خوێن تێزانی ژێر پێست

شێوەی برینەکە (قلێش یان "کۆ"+) یە.

٢ـ گوللەی نزیك (تایاردەیەك):

برینەکە قلێشێکە

نەخشی بارووتی

سووتانی بارووتی

٣ـ گوللە لە دوور (لەیاردەیەك زیاتر):

برینەکە خڕە.

لێوارەکەی بەناودا چووە.

سەرتوێژی پێستی لێوارەکەی هەڵماڵراوە.

نەخش و سووتانی بارووتی لەسەر نییە.

*ئاراستەی گوللەکە، لەپیاچوونە برین و دەرچوونە برینەوە دیاری ئەکرێت. بیر لەو شانە و ئەندامانە بکەرەوە، لەو هێڵەدان کە گوللەکەی پیا تێئەپەڕێت، ئەگەر گوللەکە کوناودەر نەبوو، ئەوا ئەبێت بەدوای گوللەکەدا بگەڕێین، یان ئێکسبەرداری بۆ بگرین تا بزانین لەکوێدا جێگیربووە.

*بۆدیاری کردنی جۆری رووداوەکە؛

تەنیا ئەو برینانە خۆکوژین، کەبەپێی دیاری کردنی دووری، لەدووریەك دا بن کەدەست بگاتە پەلەپیتکە. گەرچی بەدەگمەن هەندێك خۆکوژ، چەکەکە لەدوور خۆیەوە جێگیرئەکات و بەپەتێك ئەیتەقێنێت. لەم بارودۆخەش دا خۆکوژە مردووەکە فریای ئەوە ناکەوێت چەك و پەتەکە دەستکاری بکات. لەبەرئەوە ئەم هۆی خۆکوشتنە لەنزیك لاشەکەوە ئەبینرێت. لەزۆربەی برینە خۆکوژیەکان دا لوولە لەسەر پێست دائەنرێت و لەچەند جێگەیەکی لەشدا کەپێی ئەوترێت (جێگە خۆکوژیەکان)دا روونەدات وەك:

- لاجانگی راست لەراستەداو چەپ لەچەپلەردا.
- نێوان چاو
- ناوچەوان
- ناودەم (مەلاشوو)
- ژێر چەنە
- لاتەنیشتی سنگ
- سەردڵ
- سەرگەدە

برینی گوللەی خۆکوژی تاقانەیە، خۆکوژەکە ئەمرێت و لەیەکەم گوللەوە سارد ئەبێتەوە، لەبەر ئەوە ناتوانێت دوو گوللە یان زیاتر بنێت بەخۆیەوە کەواتە برینی خۆکوژی:

١- لەدووری‌یەك دایە، دەست بگاتە پەلەپیتکە
٢- لەشوێنێك دایە دەست بیگاتێ
٣- لەجێگە خۆکوژی‌یەکان دایە
٤- چەکەکە لەنزیك یان بەدەگمەن لەدەستی خۆکوژەکەدایە
٥- برینی خۆکوژی تاقانەیە
٦- دەستی خۆکوژەکە پیسایی و قورقوشم و نایترایت و چەوری تەقینەکەی لەسەر بەجێ‌ئەمێنێت.

کەواتە برینە تاوانی و رووداوەکان (رێکەوتەکان) گەرچی ئەشێت، جوداگانەی خۆکوژی تیابێت بەلاَم، ئەم برینانە زیاتر
١- لەدوورەوەیە
٢- بەئاراستەیەکە دەستی مرۆڤە کوژراوەکەی تێ‌نەچێت
٣- لەشوێنێکی دەرلە جێگە خۆکوژی‌یەکانە
٤- ژمارەی گوللەکان، گەرچی ئەشێت یەکێك بێت، بەلاَم لەیەکێك زیاترن
٥- چەکەکە لەنزیك کوژراوەکەوە فڕێ نادرێت
٦- دەستی کوژراوەکە پیسی و قورقوشم نایترات و چەوری تەقاندنەکەی لەسەر نی‌یە

گەرچی ئێمە گوللەی بەرێکەوتمان دیوە، نیشانەی تەقەمەنی نزیکی تیابووە تاقانە بووە، بەلاَم باروذۆخی رووداوەکە سەلماندوویەتی کەرووداو بووە نەك خۆکوژی وەك ئەوەی لەکاتی جێگەداخستن دا چەکی هەڵگیراو لەنێوان نوێن دا کەوتۆتە خوارەوەو بە خانمێك دا تەقیوە.

*بۆ وەلاَمی دوا پرسیار، هۆی راستەقینەی مردن چی‌یە؟ گەر گوللەکە کوناودەر بوو، ئەوا لەئاراستەو رارەوی گوللەکەوە، ئەگەینە ئەوەی کەزیانی بەچ ئەندامێکی کاریگەری لەش گەیاندووە و بووە بەهۆی مردن. بەلاَم ئەگەر گوللەکە لەلەش دا

مایەوە، تەنیا ڕێگە ئەوەیە کە توێکاری لاشەکە بکەین، تا بزانین، هۆی ڕاستەقینەی مردنەکە چی‌یە؟

**برینی پارچە تەقەمەنی**

بەزۆری ئەم پارچانە برینی نارێکڕێك و گەورەو بچوك، بەپێی شێوەو قەبارەی خۆیان دروست ئەکەن بەزۆری لەپارچەیەك زیاترە و هەندێك جار پارچەکە یان هەندێك لەمادە تەقەمەنی‌یەکە لەسەر لەش ئەبینرێت. یان دوور لەکونی پیاچوونی پارچەکان، پێست بەرووبەری جیاجیا ئەسووتێت. بەلام پارچەکان (بازنەی کوتران، سوتانی باڕووتی، ڕەنگی باڕووتی) یان لەدەور نابینرێت. لەم بارودۆخەدا پزیشك بەرەو ڕووی ئەم پرسیارانە ئەبێتەوە:

١- جۆری چەکەکە چی‌یە؟

٢- ژمارەی پارچەکان چەندە؟

٣- هۆی ڕاستەقینەی مردنەکە چی‌یە؟

**برینی گوللە هەوایی‌یەکان:**

کونێکی بچوك وەك کونی دەنکە قورقوشمێکی تاپڕ، دروست ئەکەن بێگومان (کوترانە بازنە، سووتان و ڕەنگی باڕووتی) لەدەور نابینرێت

ئەم برینانە کوشندە نین، مەگەر لەمناڵ دا بەر دەمارێك یان ئەندامێکی کاریگەر بکەوێت. گەرچی کوشندە نین بەلام ئەتوانن زیان و برینداری زۆر کاریگەری وەك (کوێری) لەئەنجامی پارچەیەك بدات لەچاو دروست بکەن[١٢٠].

بەشی پێنجەم

# زیانی زەبر
# و
# برینی شوێنە جیاجیاکانی لەش

هێندی ئەو زەبرەی بەرهەر شوێنێکی لەش ئەکەوێت، لەسەر بارستەی زەبردەرەکە و خێراییەکەی بەندە. ئەتوانین ئەم هێندەش بەپێی ئەم هاوکێشەیە دەست نیشان بکەین:

بارستە × خێرایی²

- ____________

٢

شیش و تێلا بەهۆی قورسی (بارستە)کەی و گوللە بەهۆی خێراییەکەیەوە زیان ئەدەن[١٣١]. چەند خاڵێکی تریش کار لەهێندی ئەم زیانە ئەکەن وەك:

١- جۆری شانەی ئەندامەکە و توانای هەڵمشتنی زەبرەکە.

٢- جوڵەی ئەندامەکە وەك یەك پارچە لەکاتی زەبر بەرکەوتنەکەدا.



زەبری سەر:

زۆربەی ئەو لاشانەی لەپزیشکی دادوەریدا ئەبینرێن، بە هۆی زەبری سەرەوە، ئەمرن[١٣٢]. کوشندەیی ئەم زەبرانە، دەرەنجامی ئەو زیانانەن کەلە ناو کەللەسەردا ئەکەونەوە؛ وەك:

١ـ بریندارى پێستە سەر (جرح الفروة ـ Scalp wounds)
پێستی سەر لەپێنج چین دروست بووە. بۆری خوێنی هێجگار زۆرە، لەبەر ئەمە برینداری‌یەکانی پێستی سەر خوێنڕێژی توندی لەگەڵ دایە. زووتر وەك لەشوێنەکانی تری لەش برینی سارێژ ئەبێتەوە.

لەزەبری داخراو (بێ‌برین) دا، خوێن لەژێر پێستی سەردا کۆئەبێتەوەو بەشێوەیەکی فراوان و ناوچەیەکی فراوانی سەر ئەگرێتەوە. بەڵام ئەگەر خوێنڕێژی‌یەکە لەکەللەسەرەوە بوو ئەوا درزەکانی کەللەسەر، لەبەر ئەوەی کەرووپۆشی کەللەسەر کەبەشێکە لەپێستە سەر، بەتوندی لەم درزانەدا بەئێسکەوە نووساوە، رێ‌لەبڵاوبوونەوەی خوێنڕێژی‌یەکە ئەگرێ و تەنیا خوێنەکە لەدرزێکەوە تادرزێکی تر کۆئەبێتەوە.

٢ـ زەبری کەللەسەر (الشدةعلى الجمجمة ـ Toauma to Skull)
کاتێك زەبر بەرسەر ئەکەوێت، چینی دەرەوەی کەللە سەر، هێندەی رووبەرو بەشێوەی ئامێری زەبردەرەکەی لێ ئەبێتەوە و بەناودا ئەچێت. هێزو وزەی زەبرەکە بەکەللەسەردا بڵاوئەبێتەوە، لەسەر چینی ناوەوە کۆئەبێتەوە وزیان بەپارچە ئێسقانێك ئەگەیەنێت زۆر لەکەلەبەرەکەی دیوی دەرەوە گەورەترە.

ئەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت نەرم و رەقی کەللەسەر بەپێی تەمەن ئەگۆڕێت، بۆنمونە لەساوادا کەللەسەر هێندە نەرمە وەك تۆپی تێنس، لەجیاتی ئەوەی بشکێت، ئەقوپێت و بەپێی کات وەك خۆی لێ دێتەوە. بەڵام لەگەورەدا، گەر زەبرەکە زۆر بێت ئەوا کەللەسەر بەیەکێك لەم جۆرانەی خوارەوە ئەشکێت:

ا ــ هێڵەشـکاوی (الکسـر الخطـی ــ # Linear ) لـەکاتێك دا دروسـت ئـەبێت کـە زەبرێکـی کـوڵ (واتـە بەرووبـەرێکی پـان)دا بکەوێت وەك کەوتنـە خـوارەوە، بەرماشـێن کـەوتن، شـت بەسـەر کەوتن.

ب ـ داچووە شکاوی (الکسر المنخفض ـ # Depressed)

ئەمـەش لەئـەنجامی زەبرێکـی توونـد و خـێراترەوە دروسـت ئەبێت. وەك چەکوش، تێلا، بۆری کەبەرسەر بکەوێت، شکاویەکە بەپارچـەیی یـان لـەلێوارەوە بـەناودا ئـەچێت. لەئێکسـبەرداری‌دا دەرئەکەوێت، کەلە ئاستی کەللەسەرەوە داچووە.

ج ـ پارچە پارچە شکاوی (الکسر المتفتت ـ # Fragmented)

ئەگـەر مرۆڤەکە لەبەرزی‌یـەکی بڵنـدەوە کەوتـە خـوارەوە، یـان بەرماشێنێکی خێرا کەوت، یان چەند جارێك بـەتووندی بەسـەری دا کێشرا، ئەوا چەند پارچە ئێسکێك لەشکاوی شوێن زەبرەکەدا لەیەك ئەبنەوە، کەلەوانەیە هەندێکیان بەناودا بچێت.

د ـ شکاوی ئاوێتە (ـ الکسر المرکب ـ # Compound)

ئەم جۆرە شکاوی‌یە لەهەموو جۆرەکانی تر ترسناکترە، چونکە شـکاوی‌یەکە بـەهۆی بریـنداری پێسـتی سـەرەوە یـان ناوپۆشـی ژێری، ناوچەکە ئەخاتە بەرمەترسـی سووتانەوەو کێم و دوومەڵ دروست بوون و سووتانەوەی پەردەکانی مێشك.

٣ـ برینداری پەردەکانی دەماخ (جروح السحایا)

دەمـاخ بەپەردەیـەکی سـێ‌توێ (چـین)، خـول دراوە، لـێرەوە بـەردەوام ئـەبن و پەتکـە دەمـاریش دائەپۆشـن و ئـەپارێزن. ئـەم چینانەش لەدەرەوە بۆ ناوەوە بریتین لە:

١ ـ تورتە پەردە (الام القاسیه ـ Dura Matter)




پەردەیـــەکی تـــورت و جـــیڕە و بەرگـــــەی برینداری زۆر ئەگرێت. بـــەتووندی بـــەدیوی نـاوەوەی کەللەســەرەوە نووســـــــــاوەو وەك ناوپۆشی کەللەسەر وایە . لەئەنجامی زەبر بەرکەوتن دا:

یەك : بریندار ئەبێت:

ئەوەش دەرەنجامی شکاوی‌یەکی وایە، کەلێواری پارچەکانی لەیـەك ترازابـن کەئـەم تورتــە پەردەیـە بریـنـدار بکـەن. ئەشـێت دووپەردەکەی ژێری بریندار بێت

دوو: خوێنە گمۆڵ (التجمع الدموي ـ Haematoma)






دوای شـکانی کەللەســـەر وپچرانـــی بۆری‌یـــەکانی خوێـــن پـەرەکانی دەماخ، بەتایبـەتی (خوێنبـەری پـەردەیی ناوەراسـت ـ Middle Meningeal artery) خوێـن لـەنێوان کەللەسـەرو تورتـە پەردەدا کۆئەبێتەوە ((خوێنەگمۆڵی دەرتورتە پەردە ـ Extradural

Haematoma) هــەندێك جــار پــاش زەبــری ســـەر بێشـــكاوی كەللەسەر، بۆرییەكانی خوێن بریندار ئەبن و ئەم خوێنە گمۆڵە دروست ئەبێت. بەتایبەتی وەك لەساوادا كە كەللەسەر نەرمە، یان دەرەنجــامی شــێواوی مــەیینی خوێــن یــان نەشــتەرگەری ژێــر كەللەسەر دروست ئەبێت[١٣٣].

لەبــەر ئــەوەی كەللەســەر رەق وداخــراوە، لەماوەیــەكی كــەم دا (تانیوكاژێر) خوێنە گمۆڵ ئەتوانێت هەندێك شوێنی گرنگی وەك (لاسكی مێشك ـ ســاق الدمــاخ) ، بپەســێرێت و كــاری مێشــك بشێوێنێت و بریندارەكە بكوژێت[١٣٤].

ئــەم خوێنــە گمۆڵــە، هۆشــی برینداركــە ئەشــێوێنێت، وەك سەرخۆشی لێ ئەكات و لەوانەیە بەسەرخۆش بدرێتە قەڵەم. وردە وردە لەگـــەڵ زۆربوونـــــی خوێنرێژییەكـــەو گـــــەورەبوونی خوێنەگمۆڵەكــەدا، بــێ هــۆش ئــەبێت و هەناســەو لێدانــی دڵ و پەستانی خوێنی ئەشێوێنێت و ئەمرێت.

هەندێك جار ئەم خوێنە گمۆڵە لەژێر تورتە پەردە، واتە لەنێوان ئەموپەردەی تۆری جاڵجالۆكەیی دا كۆئەبێتەوە. ئەمەش لەتەقینی خوێنبەرۆچكــە، بــەهۆی فشــاری خوێــن یــان زەبــری ســـەرەوە رووئەدات. هەندێك جار لەئەنجامی تەقینی گۆپكە بۆری خوێن (الام الدم ـ Berry Aneurysm)ـەوەیە.

لەزەبری سەردا، خوێن بەربوون و كۆبوونەوەكەی لەوبەرەوەیە. واتە ئەگەر زەبرەكە بەر لاتەنیشتی راستی كەللەسەر كەوت وا خوێنرێژیو خوێنە گمۆڵەكە لەلای چەپ دا ئەبێت. مەرج نییە ئەم خوێنــە گمۆڵــە هەمیشــە شــكاوی كەللــەو دڕاوی تورتــە پــەردەی لەگــەڵدا بێــت. گــەرچی لــەنیوەی راســتی جارەكــان دا ئەمانــەی لەگەڵدایە.

گەر خوێنەگمۆڵەکە پچکۆلە بوو، لەوانەیە هیچ نیشانەیەکی لەگەڵدا نەبێت.

یان ئەگەر خوێنڕێژی‌یەکە لەسەرخۆ بوو، ئەوا دەمو دەست نەخۆشەکە ناکوژێت، بەڵکو لەوانەیە دواتر کە ئەگاتە قەبارەیەکی ترسناك، بیکوژێت.

گەرکوشندە بێت، لێدانی دڵ کەم ئەکاتەوە، فشاری خوێن دەرئەکەوێت و هۆشی ئەشێوێ و ئەرشێتەوە و بیبیلەی چاوێکی فراوان ئەبێت، پاشان پلەی گەرمی لەش بەرزئەبێتەوە، ئارەق ئەکاتەوەو هەناسەی ئەشێوێت و لەکۆتایی‌دا گەرپێ نەزانرا بریندارەکە ئەکوژێت.

٢ـ پەردەی تۆڕە جاڵجاڵۆکەیی (العنکبوتیة ـ Arachnoid Matter)

پەردەیەکی لاوازە، وەك تۆڕی جاڵجاڵۆکە، تیسکی بەیەك دا چووەو ئەو بۆری خوێنانەی پیا تێئەپەڕێت کەلە تورتە پەردەوە ئەگەنە نەرمە پەردە. ژێرئەم چینە پڕە لە شلەی (مێشك ـ پەتکە دەماری ش. م. پ ـ S.C. F).

گەرچی زەبری سەر توندیش نەبێت، لەزۆربەی‌دا خوێنڕێژی لەژێر ئەم پەردەیەدا رووئەدات. هەندێك جار خوێنەگمولەکە تەنکەو بلاوەو لەوانەیە هەموو سەررووی مێشك بگرێتەوە، وەك کەسەر بەر شتێك ئەکەوێت یان بۆکسێك، تێلایەك بەرسەر بکەوێت یان کەسەر بەتووندی بەپێش و پاش دا بێت و بچێت. یان لەکاتی بەنج و نەشتەرگەری رووئەدات. ئەگەر ئەم خوێنڕێژی‌یە لە بنکی دەماخەوە بوو، ئەوا ترسناکەو لەوانەیە بریندارەکە بکوژێت. بەلام لەکاتی شکاوی کراوە (ئاوێتە) و زەبری تورتەپەردەو کوترانی مێشك دا؛ خوێنڕێژی لە زگۆڵەکانی مێشك (Cerebral Ventricle)

ەوە، خوێنە گمۆڵەکە، تێکەڵ بەشلەی (ش. م . پ. SCF) ئەبێت و زۆر زووتر هۆش ئەشێوێنێت و برینەدارەکە ئەکوژێت.

٣- نەرمە پەردە (الام الحنونة - Pia Matter)

پەردەیەکی نەرمە. سەرووی هەموو دەماخ دائەپۆشێت و بەتووندی پێوەی ئەنووسێت.

٤- برینداری مێشك (جرح الدماغ - Brain Injury)

لەزەبری سەردا؛ بێ شکاوی کەللەسەریش، ئەشێت پەردەکانی مێشك بدڕێت یان دەماخ برینداربێت و بکوترێت. بەپێچەوانەشەوە ئەشێت لەهەموو جۆرە برینداری‌یەکانی پێستەسەر، کەللە، پەردەکانی دەماخ دا مێشك بێ‌وەی و بێ‌زیان دەرچێت. زیانەکانی دەماخ بەم شێوەیەیە:

١- خوێنڕێژی:هەرناوچەیەکی دەماخ بکوترێت، لەوانەیە بۆریەکانی خوێن بریندار بن و خوێنی لێ بێت. بەمە خوێنە گمۆڵ لەناومێشکدا دروست ئەبێت. بەتایبەتی لەبەشی سەرەوەی لاتەنیشت و لووی لاتەنیشت، لووی ناوچەوان دا روونەدات. ئەم خوێنە گمۆڵانە، ئەشێت بتەقنە ناو زگۆڵەکانی مێشك و ببنە هۆی خوێنڕێژی ژێر پەردەی جاڵجاڵۆکەیی (النزف تحت العنكبوتيه).

٢- کوترانی دەماخ: ناوچەیەکی دەماخ لەشێوەی (قوچەك) دا ئەکوترێت. بنکەی قوچەکەکە لەدەرو لوتکەکەی بەرەو قوڵایی دەماخە.

٣- لەیەك پچڕانی شانەکانی دەماخ: بەدەگمەن ئەبینرێت، بەتایبەتی لەساوای شیرە خۆری خوارشەش مانگی، لەم برینداری‌یەدا (توێکڵ - القشره) ی دەماخ لەدەماخ جیا ئەبێتەوە

٥- زیانی کەللە دەمارەکان: لەبەردووری درێژی ئەم دەمارانە و هاتنە دەرەوەیان بەکونی ئێسقان یان بەناو ئێسقان دا؛ ئەشێت لەزۆر شوێن دا بریندار بن یان بکوترێن. وەك لە (ناوك) ـەکانیان

بەهۆی خوێنرێژی یان تەقینی بۆری خوێن نزیك ناوکەکانیان، یان شکانی ئەو کون و ئێسقانانەی پیاتیٚ ئەپەڕن.

پەڕە و پەردەی گویٚ:

بەئامێری تیــژ، لەوانەیــە پــەڕەی گــویٚ برینــدار بێــت، یــان پارچەیــەکی لیٚ ببێتــەوە. یــان لەبرینداری‌یــەکانی لاجــانگ دا، بەتووندی برینـدار بێـت. لەگـەڵ کـەوتن و خشـان دا پـەڕەی گـویٚ ئەڕوشێت.

پــەردەی گــویٚ: بــەهۆی بــۆری ئوســتاکی‌یەوە، هاوســەنگی پەستانی هەوا لەنێوان دیوی دەرەوەی و دیوی ناوەوەی پەردەی گویٚ‌دا ڕائەگیرێت. هەرشـتێك ئـەم هاوسـەنگی پەسـتانی هەوایـە لەنگ بکات وەك دەنگـی زۆر بـەرزی وەك تەقینـەوە، ئـەوا پەردەکـە ئەدڕێت.

بەمە برینـدارەکە یەکجاری یان تاچاکبوونـەوەی دڕاوی‌یەکەی، کەڕئـەبێت. تـەقینی پـەردەی گـویٚ، هـەندێك جـار لـەجیٚ‌چوونی ئێسـکۆکەکانی نـاوگویٚ‌ی ناوەڕاسـت و ئـامێری گـویٚ‌ی نـاوەوەی لەگەڵ‌دا ئەبێت. تەقینی پەردەی گویٚ، خوێنـی لیٚ دێـت. بـەڵام گـەر خوێنرێژی‌یەکەی زۆر بـوو یـان نەئەمـەیی، ئـەوا نیشـانەی ئەوەیـە ناوچەی ناوەڕاستی کەللەسەر لەبنکەوە یان لەلاوە شکاوە و تورتە پــەردەو جاڵجاڵۆکــەیی دڕاوەو شــلەی (ش. م. پ) ئەگاتــە گــویٚ و ئەوخوێنـە تێکەڵـەی ئـەو شـلەیەو خوێنــی برینداری‌یەکەیــە، بۆیــە نامەیێت.

چاو: لەبرینداری‌یە ڕاستەوخۆکانی چاودا؛ ئەشێت (پەڕگلێنـە ـ القرنیە ـ Cornea) برینـدار بێـت یـان (هاوێنـە ـ العدسـە ـ Lens) بخزێت. یان تۆڕەی چاو (الشبکیە ـ Retina) جیاببێتەوە. ئەشێت شلەکانی ناوچاو خوێناوی بن، ئەمانەش ئەبنە هۆی کوێر بوونی یەکجاری یان کاتی.

شین بوونەوەی دەوری چاوو پێڵو نیشانەی زەبری راستەوخۆو شکاوی ناوچەی پێشەوەی کەللەسەرن.

لووت: بەپێی توندی زەبرەکە، ئەشێت تەنیا هەڵئاوسێت یان سوور بێتەوە. ئەگەر زەبرەکە زۆر بوو ئەوا ئێسك و کرکراگەکەی ئەشکێت.

سنگ: پەراسووی منداڵ نەرمە، لەگەڵ تەمەن دا رەق ئەبن. لەپێگەیشتوودا کرکراگەکانی پەراسوو ئەبن بەئێسك.

هەموو جۆرە برینداری‌یەك لەدیواری سنگ دا رووئەدات و ئەشێت ئەم برینداری‌یە بگاتە پەردەی سی‌یەکان، سی‌یەکان، دڵ، بۆری سورێنچك، بۆری هەوا، یان بۆری‌یە گەورەکانی خوێن.

سك: ماسولکەکانی دیواری سك هێندە بەهێزن، ئەتوانن هێزی زۆر زەبری وەك بۆکس، دار، ئاسن، پاژنەو شەق هەڵمشتن. بەلاّم ئەشێت ئەم زەبرانە ببنە هۆی تەقینی جگەر، سپڵ، گورچیلە یان یەکێك لەهەناوە ناوبۆشەکان.

لەکەوتن دا، لەوانەیە بڕبڕەکان بەتایبەتی دوابڕبڕەی سنگ و یەکەم بڕبڕەی ناوقەد بشکێت یان بەزۆری ئەتەپێت (Compressed #) و هەندێك جار زیان بەپەتکە دەمار ئەگەیەنێت.

لەکەوتن دا ئێسکی (ئەستێلك ـ الحوض ـ Pelvis) ئەشکێت، ئێسکی بەرمووسەلاّن (عظم العانة ـ Pubic bone) کەشکا، ئەوا میزەجۆ (الاحليل ـ Urethra) و میزەڵدان ئەدڕێنێت.

مل: مل بەناوچەیەکی ترسناك دائەنرێت. وەك ئەزانن بۆری گەورەی خوێن و بۆری هەوا، بۆری خواردن و زۆر دەماری تیایە.

ئامێرێکی بڕەر ئەتوانێت شلەشانەکانی مل ببڕێت و بگاتە بڕبڕەکانی. ئەگەر خوێن هێنەرە گەورەکان بریندار بوون، ئەشێت هەوایان تێ‌بچێت و نەخۆشەکە بە دەمەوانەی هەوا بمرێت.

ئەگەر بۆری هەواو گەروو (ژووری دەنگ ـ الحنجرە) بریندار بوو، ئەشێت نەخۆشەکە بەخوێنرێژی ئەم بۆریانە بخنکێت، هەرچۆن لەئەنجامی شکانی کرکراگەکانی بۆری هەواوە ئەشێت بخنکێت.

برپڕەکانی مل، بەتووند نوشتانەوەی مل ئەشکێن یان لەجێ ئەچن، و ئەشێت ببنە هۆی برینداربوونی پەتکە دەمار (النخاع الشوکی) و مردن.

## بەشی شەشەم

# ڕووداوەکانی هۆکانی گواستنەوە

جاران هۆی گواستنەوە ئاژەڵی بەرزە بوو، مرۆڤ یا لەسەرپشتی ئەکەوتە خوارەوە یان فڕێی ئەدا یان شۆق یان جووتەی لێ ئەدا یان گازی لەمرۆڤ ئەگرت. بەڵام ئەمڕۆ هەموو هۆکانی گواستنەوە گەورەترو خێراترو بەبارستەترن. بەمە کەبەر مرۆڤێك ئەکەون، یان کەوەرئەگەڕێن یان بەرماشێنێکی تر ئەکەون، جگە لەمەترسی بارستەو خێرایی، مەترسی تەقینەوەو سووتانیشیان هەیەو ئەشێت پارچەیەکی لەش یان هەموو لەشی مرۆڤەکە لەژێریان دا گیر بخوات، یان بپلیشێتەوە. لەبەرئەوەی جادەو بانەکان پڕن لەماشێن، وابە درێژتر باسی ڕووداوەکانی ماشێن ئەکەین

**بەرماشێن کەوتن:-**

ڕێبوارێك کەبەر ماشێنێك ئەکەوێت، جگە لەبارستەو خێرایی ماشێنەکە چەند خاڵێکی تر هەن کار لەتوندی و چەشنی برینداری‌یەکان ئەکەن، وەك تەمەن (مناڵە یان مەزنە؟)، لەش ولار (لەڕەیان قەڵەوە؟).

ئەگەر ڕێبوارەکە مناڵبوو، ئەوا پێشی ماشێنەکە (بەرکەوتە ـ الدعامیە) کەبەرشوێنێکی بەرزی لەشی وەك ناوقەد، سنگ، سەروملی ئەکەوێت و زیانەکان زیاتر لەو ناوچانەدا ئەدەن.

بەڵام ئەگەر ڕێبوارەکە قەڵەو بێت، چەوری‌یەکەی وەك (کوشن) ێك زۆربەی هێزی زەبرەکە هەڵئەمشێت و زیانەکانی کەمتر ئەبێت. گەرچی لەبەر چەوری‌یەکە لەمرۆڤێکی لاواز زیاتر شین ئەبێتەوەو

خوێن زیاتر ئەڕژێتە ژێر پێستی. بەرماشێن کەوتن بەم قۆناغانەدا ئەڕوات:

قۆناغی یەکەم: بەرکەوتن

بەپێی ئەوبەشەی ماشێنەکە کەبەر مرۆڤەکە ئەکەوێت، ئەوبەشەی لەش ئەڕوشێنێت. لەڕێبواری گەورەدا بەشی سەرەوەی ئێسکی لاق و ئەژنۆ زیان ئەبینن. ئەگەر شوفێرەکە (ئیستۆپ)ی کرد، ئەوا پێشی ماشێنەکە نزم ئەبێتەوەو بەرشوێنێکی نزمتر ئەکەوێت وەك لەوەی چاوەڕوان ئەکرێت.

قۆناغی دووەم: فڕێ دان

لەبەر کورتی و بچوکی مناڵ، ماشێنەکە هەمیشە بەرەو پێشەوە فڕێیان ئەدات. لەمرۆڤی گەورەدا، لەبەرئەوەی (بەرکەوتە) ی ماشێنەکە بەر ئەژنۆ یان لاق ئەکەوێت، مرۆڤەکە هەڵئەداتە سەر (بۆنیت) ی ماشێنەکە، لەم بڕەش دا ئەشێت سەری بەر جامی پێشەوە یان سەربانی ماشێنەکە بکەوێت، یان گەر بەتووندی لێیدا، ئەوا لەسەر (بۆنیت)ەکەوە هەڵی ئەداتە پشت ماشێنەکە.

قۆناغی سێیەم: پاش فڕێدان[١٣٥]

لەم قۆناغەدا یەکێك لەمانەی خوارەوە روو ئەدات:

- تایەی ماشێنەکە بەسەر ڕێبوارەکەدا ئەڕوات.
- لێدراوەکە (ڕێبوارەکە) بەدوای خۆیدا رائەکێشێت.
- لێدراوەکە فڕێ ئەداتە ناو ئاو یان لەبەرزاییەکەوە تل ئەبێتەوە، بەهۆی کەوتنەکەوە بریندار ئەبێت یان ئەمرێت.

شوێن تایە لەسەرپشت بەشێوەی رووشان و کوتران دەرئەکەوێت، ژێر پێست مۆر ئەبێتەوەو خوێنی تێئەڕژێت

گەربەدوای خۆیدا رایکێشا، لەش ئەڕوشێت، ئەکوترێت، پێست و گۆشت دائەماڵرێت.

لەکەوتنە خوارەوەدا هەموو جۆرە زیانێکی پێئەکەوێت.
لەئەنجام دا، ئێسقان ئەشکێت، هەناو ئەتەقێت، خوێن ئەرژێت.
بەریەك کەوتن و وەرگەڕان:
هەندێك جار دوو ماشێن ڕووبەڕوو بەیەك دا ئەکێشن. بەمەش سواربووەکان بەرەو پێشەوە ئەترازێن و فڕێ ئەدرێن. بەڵام گەر لەدواوە ماشێنێکی تر لێیدا ئەوا بەتووندی سواربووەکان بەرەو دواوە ئەشکێنەوە، بەمە ئەشێت ملیان بشکێت یان لەجێ بچێت. سنگی شۆفێرەکە بەر (سوکان)ەکە ئەکەوێت. هەندێك جار بەر مل و کاکیلەی خوارەوە ئەکەوێت و زیانیان پێ ئەگەیەنێت. ئەشێت کەجامی پێشەوەی ماشێنەکە بشکێت و ورد بێت و دەم و چاو بریندار بکات. ئەگەر سەر و دەموچاو بەرجامەکە کەوت و نەشکا، ئەشێت لووت و ناوچەوان بشکێت یان بریندار بێت. ئەگەر بەریەك کەوتنەکە توووند بوو، ئەوا کەللەسەر ئەشکێت و زیان بەدەماخ و پەردەکانی ئەگات.
(دەشبۆل)ی ماشێنەکە سەر ئەژنۆکان ئەڕوشێنێت، بریندار ئەکات، لەوانەیە سابوونەی ئەژنۆ بشکێنێت، ئەژنۆ بشکێت یان بەرەودوا لەجێی ببات. یان ببێتە هۆی دەرچوونی سەری ئێسکی ران و بەناو ئێسکی سێبەندەدا لەجێی ببات(١٣٦)
ئەگەر بەیەکداکێشانەکە زۆر توووند بوو کەمەکینەکەی بێنێتە دواوە بۆ شوێنی دانیشتنی پێشەوە، ئەوا لاق ئەشکێت.
ئەگەر شۆفێرەکە ئیستۆپ بکات، ئەوا شوێن پێی ئیستۆپەکە لە ژێرپێڵاوەکەی دەرئەکەوێت. بەمە شوفێرەکە ئەناسرێتەوە، هەروەها ئەوەش دەرئەکەوێت کەئیستۆپی کردووە یان نەی کردووە.

لەڕووداوی ماشێنی بارهەڵگرو شەمەندەفەردا، هەمان ئەم زیانانە ڕووئەدەن، بەڵام لەبەرئەوەی بارستەو خێراییەکەیان زیاترە، ئەوا زیانەکانیان گەورەتر ئەبێت. یان بەشێکی لەشی سواربووەکان ئەکەوێتە ژێر قورسایی بەشێکی ئەم بارستە ئاسنانە.

بەشی حەوتەم

## زیانی هۆکارە سروشتییەکان

مەبەستمان لەهۆکاری سروشتی؛ گەرمی و ساردی و هەورە بروسکە و تەوژمی ئەلەتریکە

زیانەکانی گەرمی:

زیانەکانی گەرمی لەسەر چەند خاڵێك بەندن

١- تەمەن

٢- توندیی گەرمییەکە

٣- رووبەری بەرکەوتنی لەش بەگەرمییەکەوە

٤- وشك بێ یان تەڕ (گەرمی وشك یان گەرمی تەڕ)

٥- کاتو درێژی بەریەك کەوتنەکە

بۆنموونە: ساواو پیر کەمتر بەرگەی گەرمی ئەگرن، تاگەرمییەکە تووندتر بێت، بەکاتێکی کەمتر، زیانێکی زۆرتر ئەدات، وەك (٥-٦کاژێر) مان ئەوێت تا گەرمی (٤٤) پلەی سەدی ئەوزیانە بدات کە (٦٥) پلەی سەدی لە (٢) چرکەدا ئەیدات[١٣٧].

خۆربردن: بریتییە لە لەش خاوبوونەوەو بورانەوە بەهۆی تینی خۆرەوە[١٣٩] لەم بارەدا، ئارەق کردنەوە ئەوەستێت، بەردەوام پلەی گەرمای لەش بەرز ئەبێتەوە (مەڵبەندی رێکخستنی گەرما) لەمێشك دا سست ئەکات و گەرمای لەش بە بەردەوامی بەرز ئەبێتەوە، بەمەش (٤٠٪) یان ئەمرن، بەڵام ئەگەر گەرمییەکە لە (٤٣,٣) پلەی سەدی تێپەڕی ئەوا لە (٨٠٪) یان ئەمرن[١٤٠]

ئەگەر مرۆڤێك لەناوچەیەکی ساردەوە یان فێرە سێبەر، توشی خۆرەتاو یان هەوایەکی گەرم بوو، لەبەرئەوەی رانەهاتووە، زووتر و زۆرتر زیانی لێ ئەکەوێت.

بێگومان، ئەم خۆربردنە لەهاوین دا ئەبێت، بەتایبەتی لەوانەی کە لەبەر بەرەلایی و خۆرەتاودا کارئەکەن و ماندوو ئەبن. لەسەرەتادا مرۆڤەکە ئەیەشێت، سەری گێژ ئەبێت، تای لێ دێت، ورێنە ئەکات، تاوای لێ دێت مت ئەبێت، لێدانی دڵ خێرا ئەبێت، کەمێك پەستانی خوێن بەرز ئەبێتەوە، پێست وشك ئەبێت و سوور هەڵئەگەڕێت، گەر مرۆڤەکە لەو گەرمایەدا، بەوشێوەیە مایەوە، ئەوا ئەمرێت.

پاش توێکاری لاشە، گەرچی لەهەندێك لاشەی خۆربردوودا کەمێك مێشك ئەئاوسێت، بەلام هیچ نیشانەیەکی تایبەت بەخۆر بردنەکە نابینرێت.

سووتاوی: بریتی‌یە لەو برینەی کەشانەکان بەهەڵقرچاندن تێك ئەشکێنێ. لەولاتی ئێمەدا، هۆی گەرم کردنەوەو ئاش لێ نان ئاگری کراوەیە، وەك مقەلی، سۆپای دارو نەوت و گاز، سۆپای بیلادی و (علا ء الدین). هەروەها (گەرماوی) تووندارمان هەیە بەدارو نەوت دائەخرێت، لەزستان دا سووتان زیاتر رووئەدات. زۆربەی سووتاوی‌یەکان (بەرێکەوت)ەو زۆر جار خانمان بەسووتان خۆیان ئەکوژن.

لەکۆڕەوەکەی ساڵی (١٩٩١ ز)دا چەند پیرەژنێك بینران، کە بەهۆی ئەوەی نەوت رژابووە ژێریان و ماوەیەکی درێژ لەبەر بارودۆخی کۆڕەوەکە تیایدا مابوونەوە، زۆربەی لەشیان سووتابوو. بلقی کردبوو، زۆر بەئازار بوو، پێستی هەڵدابوو، زۆربەیان بەسووتاوی‌یەکەیان مردن. سووتاوی زۆرجۆی هەیە، بۆنمونە لەنەشتەرگەری نوێدا بەم شێوەیە پۆلێن ئەکرێت:

١- سووتاوی رووکار، کەتەنیا سەرتوێژی پێست ئەگرێتەوە.

٢- سووتاوی سەراپایی، کەسەرتوێژ، توێژ ئەگرێتەوە.

لەپۆلێن کردنێکی تردا:

پلەی یەک: سووتانی رووکاری سەرتوێژ

پلەی دوو: سووتانی سەرتوێژ و توێژ

پلەی سێ: سووتاوی چەوری ژێر پێستیش ئەگرێتەوە

هەروەها بەم جۆرەش پۆلێن ئەکرێت:

پلەی یەک: سوور بوونەوە وەک خۆربردن

پلەی دوو: پێست بلّق ئەکات

پلەی سێ: سووتاوییەکە هەموو پێست ئەگرێتەوە

پلەی چوار: پێست هەڵئەقرچێت و وەک چەرمی لێ دێت

پلەی پێنج: ژێر پێست ئەسووتێت

پلەی شەش: هەموو شانەکانی ئەوبەشە سووتاوە ئەبێت بەخەڵوز[١٤١].



پلەی (چوار ـ شەش) چەند جوداگانەیەکی هەیە؛

١ـ قڵیشانی پێست: هەڵمی گەرمی ژێر پێست، لەژێرەوە زۆر لەپێستەکە ئەکات و ئەیقڵیشێنێت. زۆر جار بەهەڵە بەبرینداری ئەدرێتە قەڵەم.

٢ـ شکاوی: وەک تەقینی کەللە سەر: هەڵمی گەرمی مێشکە سووتاوەکە، بەتایبەتی لەپیردا، کەللەسەر ئەتەقێنێت.

ئێسکەدرێژەکان بەدوو هۆکار ئەشکێن:

ا ـ هەڵمی گەرمی ناوەکەی

ب ـ هەڵقرچانی ماسولکەکان

ئەم شـكاوییانەش بـەوە لـە شـكاوی پێـش سـووتانەكە جیـا ئەكرێنـەوە، كەقەراغی شكاوییەكە، هیچ (زینـدە چالاكی) یـەكی تیانابینرێت.

هـەندێك جـار بۆچەواشـەكردنی لایەنـە بەرپرسـەكان، پـاش كوشتنی نێچیرەكە، تاوانكار لاشەكە ئەسووتێنێت، تاهەندێك جار ئـەبێت بەخـەڵوز. چـۆن بتوانـین ئـەم سـووتاوی دوای مردنـە لەسووتاوی پێش مردن (یان هۆی مردن) جیابكەینەوە:

بۆئەم جیاكارییە، بالەم خشتەیەی خوارەوە بڕوانین:

| زنجیرە | نیشانەكان | سووتان بەزیندوویی | سووتان بەمردوویی |
|---|---|---|---|
| ١ | گەردیلەی كاربۆن لەسـەر ناوپۆشـی بۆرییـەكانی هەوا. | ئەبینرێت | نابینرێت |
| ٢ | هێنـدی (كـاربۆن مۆنۆكساید) لەهەوای ناو سیكڵدانۆچكەكان دا[١٤٢] | بەرزە | ئاساییە |
| ٣ | رەنگی هەناو | پەمەییە | ئاساییە |
| ٤ | پرۆتینـی نـاو بڵقـەكان | بەرزە، زۆرە | كەمە |
| ٥ | سـووربوونەوەی قـەراغ سووتاوییەكە[١٤٣] | ئەبینرێت | نابینرێت |
| ٦ | زیندەچـالاكی قـەراغ سووتاوییەكە | ئەبینرێت | نابینرێت |

ئـەبێت ئـەوەش بڵێـین؛ کەسـووتان گـەرچی بگاتـە خـەڵوز، ناتوانێت زیانی ئامێرێکی تر کەلەهەناو درابێت، بشارێتەوە.
گـەر زۆربـەی سـووتاوی‌یەکەش بووبێـت بەخـەڵوز، لەقـەراغی سووتاوی‌یەکەی کەنەبووە بە خەڵوز، بەدوای (زیندەچـالاکی) دا ئەگەڕێین.

ماکی سووتاوی:

١ـ لێدان (الصدمة ـ Shock): بەهۆی ئازاری سووتاوی‌یەکەوە.

٢ـ لێدانـی ناوەندی: بەهۆی لەدەسـت دانـی زەرداوی خوێـن و شلەی لەشەوە.

٣ـ ژەهراوی بوون: پاش هەڵمژینی پاشەڕۆی سووتاندنەکە.

٤ـ سووتانەوە: سووتاوی‌یەکە ئەسـووتێتەوەو بەلـەش دا بـڵاو ئەبێتەوە.

٥ـ ناهاوسەنگی ئاوروخوێ‌ی لەش.

٦ـ تیژە سستی‌ی گورچیلە: بەهۆی دابەزینی پەسـتانی خوێـن و کەم بوونەوەی شلەی لەش و زەرداوی خوێن.

٧ـ لەکۆئەندامی هەرس دا: هەوی تیژی دوانزەگـرێ (Curling Ulcer) و کشـانی گـەدە (Dilatation of Stomach) وخوێـنرێژی ریخۆڵەکان .

٨ـ ئاوسان و گیرانی راڕەوی هەناسە: بەهۆی هەڵمژینی هـەڵم و هەوای گەرم[١٤٤]

سووتانی ئەلەکتریکی؛ گرتن؛ هەورە بروسکە

کاریگەری عەلەتریك لەسەر سێ‌خاڵ بەندە:

١ـ توونديی تەوژم - واتە ئەمپێری

٢ـ توانای تەوژم - ڤۆڵتی

٣ـ بەرگری - ئۆمەکەی

لەم هاوکێشەیەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە

توونديى تەوژم - <u>تواناى تەوژم</u>[١٤٥]

بەرگرى

توندیـــی تـــەوژم، گرنگـــترین هۆكـــاره لـــەدیاری كردنـــی كاریگەری[١٤٦] تەوژمی عەلەتریك.

بۆنمونه:

بەیەك ئەمپێر هەست بەتەوژمی عەلەتریك ئەكرێت.

بەبیست - ماسولكەكان بەئازارەوه كرژ ئەبن.

بەشەست - ترسناكە

بەسەد - كوشندەیه[١٤٧]

چـەند هۆكـارێكی تـر هەیـه كـه كـار لـه كاریگـەری تەوژمـه ئەلەكتریكەكه ئەكات:

١- رووبەری ئەو بەشەی بەر تەوژمەكه ئەكەوێت.

٢. بەرگری لەش یان ئەوبەشەی لەش.

٣- گەیەنەرێك بەزەوی (وەك دەستی تەڕ، یان قاچی رووت).

٤- كات و درێژی بەریەك كەوتنەكە.

تاڕووبـەری ناوچەكـه فراوانـتر بێـت، كاریگەرییەكـەی كـەمتر ئەبێتـەوه. سـوود لەمـه وەرگـیراوه لەدروسـتكردنی سـووتێنەر (Cautery) كەسەرێكی عەلەتریكەكە بەهۆی رووبەرێكی فراوانەوه بەرلـەش ئـەخرێت، تاسـەرەكەی تـر لـه ناوچەیـەكی بچوكـدا، بەتەوژمێكی بەرز، ناوچەیەكی بچوك بسووتێنێت.

تا بەرگری ناوچەكە زیاتر بێت، كاریگەرییەكه كەم ئەبێتەوه بۆ نموونه:

بەرگری پێستی لەپی كرێكارێك، ئەگاتە چەند ملیۆن (ئۆم) ێك، بەڵام گەر ئەم دەستە تەڕ بكرێت، ئـەوا بەرگرییەكـه ئـەبێت بـه (چەنـد دە) ئۆمێك.

زیانەکانی تەوژمی عەلەتریك:

١- ئەشێت تەنیا پیاچوون و دەرچوونە برینی هەبێت، لەناوەوە زیانی نەدابێت.

٢- ئەشێت کار لەدڵ بکات، لێدانی زکۆڵە بشێوێنێت، مرۆڤەکە بکوژێت و هیچ نیشانەیەك لەسەر پێست بەجێ نەهێڵێت.

٣- ئەشێت ماسولکەکانی هەناسەدان ئیفلیج بکات و هەناسە بوەستێنێت و مرۆڤەکە بکوژێت.

٤- ئەشێت بەرسەر بکەوێت، کۆئەندامی دەمار بشێوێنێت.

٥- دواتر ئەشێت خوێنڕێژی بکات و مرۆڤەکە بکوژێت(١٤٨)

٦- پاشتر، ئەبێتە هۆی (زووشت لەبیرچوونەوەی پێش وەخت) کوێر بوون، ئاوی رەشی چاو، نەدوویی و گۆڕانی هەڵس و کەوتی مرۆڤەکە(١٤٨)

سووتانی عەلەتریکی:

ناوچەیەکی رەنگ هەڵبزرکاوی، قڵیشاوە قەراغەکانی رەقە، هەندێك جار بڵقی لەدەور ئەبینرێت. دەورەکەی سوور ئەبێتەوە.

ئەمەش ئەشێت لەشوێنی چوونە ژوورەوەو چوونە دەرەوەی تەوژمەکەدا دروست ئەبێت. زۆر جار ئەم سووتاویانە خڕ یان هێلکەیین، وشك و رەقن. ئەشێت، هێندێك لە کانزای تەواوەی ئامێرە عەلەتریکییەکەی تیا بەجێ بمێنێت. هەر ئەمەیە کە پیاچوونە برین لەدەرچوونە برین جیا ئەکاتەوە.

گەرتووندی تەوژم زۆر بێت، ئەوا برینەکە رەنگی کانزا گەیەنەرەکە، ئەگرێت، وەك ئەوەی (شین ئەگەر مس بێت) یان (رەش ئەگەر ئاسن بێت).

زۆر گرنگە کەئەم دوو برینە (پیاچوون و دەرچوون) بدۆزینەوەو بناسینەوە، بۆ نموونە: ئەگەر بەسەردا رۆیشت،

مەڵبەندەکانی مێشك ئیفلیج ئەکات. گەر بەسنگدا رۆیشت، لێدانی دڵ ئەشێوێنێت یان ئەوەستێنێت.

لەتوێکاری لاشەدا: خوێنەکە هەر شلەو هەندێك پنتە خوێنڕێژی لەچاو، دڵ و سی‌یەکاندا ئەبینرێت.

بەرهەورە بروسکە کەوتن:

هەورە بروسکە، بارگەیەکی عەلەتریکی جێگر یان تەوژمێکی راستەوخۆی زۆر توونده، لەهەوادا دروست ئەبێت و بەهۆی گەیەنەرێکەوە لەزەوی‌دا بەتاڵ ئەبێتەوە.

مووی لەش ئەسووتێت، موولوولەکانی خوێن، فراوان ئەبن. بەمە پێستی سنگ و ئانیشکەکان (هێڵ هێڵ وەك رەگی درەخت) ی لەسەر دەرئەکەوێت. لەوانەیە هەورە بروسکەکە جل‌وبەرگی قوربانی‌یەکە بدڕێنێت. هەرشتێك لە دەست دا بێت (وەك چەتر یان چەك) ئەشکێت بێ ئەوەی پێستەسەر سووتابێت مووی سەر ئەسووتێت، وەك ئەوەی کەتاشرابێت.

هەر کانزایەکی پێ بێت، وەك دراو، کلیل، چاویلکە ئەتوێتەوە و ئەبن بە موگناتیس[١٥٠]. دەرچوونە برین لەپێ‌دا ئەبینرێت و لەدەرچوونە برینی سووتاوی عەلەتریکی ئەچێت. برینداری‌یەکانیش هەروەك سووتاوی عەلەتریکی وایە بەلام توندتر و هەندێك جار سی‌یەکان یان هەناوێکی تر لەشوێنی خۆی هەڵئەتەکێت یان هەناوەکە ئەتەقێنێت یان ئێسك ئەشکێت.

سووتاوی‌یەکانی تر

سووتاوی تیشك:

١ـ تیشکی سەروبنەوشەیی: وەك بەخۆرسووتاندن ئەگەر ماوەیەکی دوورو درێژ بەرچاو بکەوێت، مرۆڤەکە کوێر ئەبێت.

٢ـ ئێکسبەرداری: خانەکان تێك ئەشکێن، بۆری خوێن بریندار ئەبێت، ناوچە سووتاوەکان زۆر لەسەر خۆ ساڕێژ ئەبنەوە.

پەڵەیان لەشوێن بەجێئەمێنێت، لەئەنجامدا ڕێخۆش ئەکەن بۆ شێرپەنجەی پێست.

٢ـ تەقینەوەناوکی‌یەکان:

ئەبنە هۆی سووتاوی‌یەکی قورس، مرۆڤەکە بریندار ئەبێت، ئێسکەکانی ئەشکێت جگە لەوەی زیانە باسکراوەکانی ئێکسبەرداری بەچەشنێکی قورستر لێ دەرئەکەوێت.

سەرماو ڕەق بوونەوە:

سەرما وەك گەرمی، لەپلەیەکی دیاریکراودا، کارلە هەربەشێکی لەش و لەهەموو لەش ئەکات. سەرمای خوار (٢٨ پلەی سەدی) ترسناکە. ئەمەش بێگومان لەرۆژە ساردەکانی زستاندا زیاترە، پەلەکان و لووت و پەرەی گوێ ئەگرێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی ماوەیەکی دوورو درێژ لەسەرمادا ئەمێننەوە[١٥١] وەك پێشمەرگەو سەرباز و ڕاوچی.

سەرما وەك گەرما دووجۆری هەیە، وشکە سەرما، سەرمای تەڕ، بەهەردووکیان ئەبنە هۆی خاوبوونەوەی[١٥٢] سووڕی خوێن، برینداری بۆریەکانی خوێن، شلە دەڵاندن، هەڵئاوسان، خوێن خەستتر ئەبێتەوە و سووڕی خوێن لەوبەشەدا یان سست ئەبێت یان ئەوەستێت و دەمارەکان بریندار ئەبن. لەسەرمای وشکدا؛ ئەو بەشە تووشی (لاڕەشە ــ الموات ــ Gangrene) ئەبێت. بەلام لەسەرمای تەڕدا، لاکە ڕەش نابێتەوە، بەلام کارێکی توونـد لەدەمارو بۆری‌یەکانی خوێن ئەکات[١٥٣].

لەپێشەوە، ئازارێکی توند ئەکەوێتە ناوچە سەرمابردووەکە، پاشان سڕئەبێت، ڕەنگی ئەبزرکێت، پاشان سوور ئەبێتەوە و هەڵئەئاوسێت، شین ئەبێتەوە، ڕەش ئەبێتەوە و پێستەکە ئەمرێت.

رەق بوونەوە:

منداڵ و پیر، کەمتر بەرگەی سەرما ئەگرن[١٥٤]. ئەگەر مرۆڤ بێجووڵە (وەك چەقینی ناو رێبەندان) ماوەیەکی دوورو درێژ لەناوبەفردا مایەوە، ئەوا رەق ئەبێتەوە.

لەسەرەتادا بۆری خوێنی پێست فراوان ئەبێت و پڕ ئەبێت لە خوێن، لەبەر ئەمە رەنگەکەی ئەبێت بەسوورێکی گەش، پاشتر زەرد ئەبێت، هەڵئەلەرزێت، بەڵام کەپلەی گەرماکەی دابەزی بۆ (٢٩,٦-٣٢,٦ پلەی سەدی) ئیتر لە لەرزین ئەکەوێت، لەش خاو ئەبێتەوەو هۆش ئەشێوێت، لێدانی دڵ و هەناسە و پەستانی خوێن کەم ئەبێتەوە و خەوی لێ ئەکەوێت. لەشی ساردو رەق ئەبێت. کەپلەی گەرمای لەش گەیشتە (٢٥) پلەی سەدی، پەستانی خوێن زۆر دائەبەزێت، لەم قۆناغەدا، دڵ سست ئەبێت و مرۆڤەکە ئەمرێت.

بۆ ناسینەوەو جیاکردنەوەی مرۆڤێکی رەق بووەوە، جگە لە باردودۆخی رەق بوونەوەکە، هیچ نیشانەیەکی، هۆیەکی تری مردنی پێوە دیار نییە.

بەهۆی سەرماوە دەم و چاو و شوێنە رووتەکان زەرد هەڵئەگەڕێن، دەنا لە توێکاری لاشەدا هیچ شتێك نابینرێت، کەتایبەت بێت بەرەق بوونەوە.

## بەشی هەشتەم

# خنکـــان و خنکـــاندن

لـەتێنواڕینی کارئـەندام زانی‌یـەوە، ژیـــان بریتی‌یـــە لەکۆمەڵـــە چالاکی‌یـەکی ئەندامــە جیاجیاکـانی لــەش، هــەندێك ئـەندام زۆر گرنگــە بــۆ ژیـــان وەك دڵ و ســــووڕی خوێـــن و مێشـــك. ئـــەم چالاکی‌یانـەش پێویسـتی‌یان بـەوزە هەیـە، وزەش پێویسـتی بـە ئۆکسجین هەیە. جا هەر هۆکارێك خانەکانی لەش لـەم ئۆکسـجینە بێ‌بەش بکات، ئەوا لەدروست بوونی وزەو چالاکی‌یەکانی بێ‌بەش ئەکات.

ئەم بێ‌ئۆکسجینی‌یەش کۆمەڵێك هۆی هەیە وەك:

١ـ کەم بوونەوەی ئۆکسجین لەشوێنەوار (وەك شوێنی تەسك و هەوابڕ).

٢ـ زۆربوونی هەندێك گازی وەك (کاربۆن مۆنۆکسـاید)، بەهۆی سووتانی ناتەواوی نەوت و بەنزین و خەڵوزو دارەوە، لەشوێنێکی داخراودا. ئەم گازەش شوێن بە ئۆکسجینی ناو خڕۆکە سوورەکان چۆڵ ئەکات.

٣ـ گیرانی ڕاڕەوی هەناسە، هـەر لەدەم و لووتـەوە، تـاقوڕگ و قوڕقوڕاگە، بۆری هـەوا یـان پڕبوونـی سـیکڵدانۆچکەکان بەشـلە، بەمانـە هـەوا ناگاتـە دیـواری سـیکڵدانۆچکەکان و ناگاتـە خوێـن تابەسەر خانەکانی لەشدا، دابەش بکرێت.

٤ـ هـەندێك ژەهـری وەك"سـیانید" ئەبنـە هـۆی تێکشـکانی ئـامێری هەناسـە و وزەی خانــە. گــەرچی خوێنیـــش پڕبێـــت لەئۆکسجین، بەڵام خانەکانی لەش سوودی لێ نابینن.

کاریگـەری بێئۆکسـجینی لەسـەر شـانەکانی لـەش وەك یـەك نیـیـە، بـۆ نموونـە: شـانەی دەمـار پێـش هـەموو شـانەکانی تـر لەکارئەکەون. لەدەمارەشانەشدا، ئەوبەشانە زووتر ئەشێوێن کـە فرمانەکەیان ووردترە. مێشکی مرۆڤ ئەگەر لە (٣) خولەك زیاتر ئۆکسجینی لێبڕا، ئەمرێت[155]

کاتێك خانەکان بێئۆکسـجین ئـەبن، وزە دروست نابێت، وزەی ڕاگرتنـی پـەردەی دیـواری خانـە نـامێنێت. بـەم شـێوەیە (سـۆدیۆم_Na+)شـوێنی (پۆتاسـیۆم_ K+) ی نـاو خانـەکان ئەگرێتـەوەو ئـاوی لەگـەڵدا ڕائەکێشـێت و بەمـە خانـەکان هەڵئەئاوسن. بێگومان ئەمە پێش هەموو شانەیەکی تر لەدەمارە شانەدا ڕووئەدات، بەمە مرۆڤەکە زۆر زوو هۆشی ئەشێوێت و گەر مرۆڤەکـە لـەمردن ڕزگـار کـرا ئـەم زیانـە دەماریـیانـە هـەر ئەمێنێتەوە[156].

خنکان (الاختناق ـ Suffocation)

بریتیـیە لە گیرانی بۆری هـەوا یان پڕبوونـەوەی بۆریـیەکانی هـەوا بـە شـلەیەك، یـان بـەگازێك کـە نـەهێڵێت ئۆکسـجین بگاتـە سیکڵدانۆچکەکان یان جێی ئۆکسجین لەخوێندا بگرێتـەوە، بەمە خانەکان لەئۆکسجین بێبەش ئەبن.

قۆناغەکانی خنکان[157].

لەسـەرەتای خنکانـەوە تـا مـردن، مرۆڤـە خنکاوەکـە بـەچوار قۆناغدا تێئەپەڕێت و ئەشێت خۆی یان یـەکێکی تر لەهەریـەکێك لەم قۆناغانەدا بووەستێت و ڕزگار بێت.

١ــ قۆنـاغی سـەرەتایی: هەناسـەدان ئەشـێوێت، جارجـار ئەوەسـتێت، بەهەنسـکێك ئەگەڕێتـەوە. وردە وردە (کـاربۆن دایۆکساید)، لەخوێندا بەرز ئەبێتەوەو لەش شین ئەبێتەوە.

٢ـ قۆناغی ناوەندی: خنکاوەکە لنگەفرتێی هەناسەدان ئەکات، لەش رەق ئەبێت. بیبیلە فراوان ئەبێت، لێدانی دڵ هێواش ئەبێتەوە، پەستانی خوێن بەرز ئەبێتەوە، مرۆڤەکە بێ هۆش ئەبێت.

٣ـ قۆناغی پێش کۆتایی: لەش خاو ئەبێتەوە، گوو و میز ئەکات بەخۆیدا، پیاو تۆواو فڕێ ئەدات. لێدانی دڵ زۆر ئەبێت و پەستانی خوێن دائەبەزێت.

٤ـ دوا قۆناغ: هەناسە ئەوەستێت، ئەوەندە نەبێت جار جارە جوڵەیەك لەسنگ دا ئەبینرێت. دڵ لەچارەکە کاژێرێکدا ئەوەستێت.

خنکاوەکە شین ئەبێتەوە، چاوی بەچاڵ (قوڵ) دا ئەچێت، پێڵوەکانی هەڵئەئاوسێت. لەوانەیە زمانی لەدەمی‌یەوە دەرپەڕێتە دەرەوە، کەفێکی سپی، هەندێك جار سووربباو لەدەمولووتی‌یەوە دێتە دەرەوە.

پنتەخوێنرێزی (Petichea) لەسەروملدا، دەرئەکەوێت. بەتایبەتی لەناو پێڵووپۆش (Conjuctiva) ماوەیەك ئەمێنێتەوەو نامێنێت. ئەمەش لەئەنجامی هەڵئاوسانو تەقینی بۆریچکەکانی خوێن و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێنی ناو ئەم بۆریچکانەوە دەرئەکەوێت. لەلاشەتوێکاریدا لەژێر رووپۆشی دڵ وسی‌یەکان دا ئەبینرێت و بەناوی ئەو زانایەی کەیەکەم جار هەستی پێکرد، ناونرا (تاریدیو). جگەلەم گۆڕانانەی باس کران، مێشك ئەئاوسێت، سی‌یەکان ئەئاوسێن و خوێن بە نەمەیوی ئەمێنێتەوە[١٥٨].

**خنکاندن (الخنق ـ Strangulation)**

بەدەست، گوریس، یان پارچە کوتاڵ، پەستان ئەخرێتە سەرمل، بۆری‌یەکانی هەوا دائەخرێت؛ ئەمەش جۆری زۆرە وەك:

١ـ خۆخنكاندن: مرۆڤەكە پەتێك هەڵئەخات و ملی پێوە ئەكات و كەلەملی جەڕا، بەیەكێك یان چەند خاڵێك لەمانەی خوارەوە هاوكات ئەمرێت:

١ـ پەستاوتنی خوێنهێنەرەكانی سەروملی

٢ـ پەستاوتنی وێڵەدەمار (العصب التائە ـ Vagus Nerve)

٣ـ شكان و قوپانی بۆری هەوا، یان ژووری دەنگ (قوڕقوڕاگە)..

٤ـ شكان و لەجێ‌چوونی بڕبڕەكانی مل و برینداربوونی پەتكە دەمار.

هێڵی شوێن پەتەكە خوارەو ئەكەوێتە بەشی سەرەوەی مل، ئەشێت پێچێك یان چەند پێچێك لەمل ئاڵاندرابێت، گرێكەی ئەكەوێتە لایەكی سەر، پشت گوێ‌دا؛ لەبەری شوێنی گرێكە، زۆر بەتووندی كارلەپێست و شانەكان ئەكات[١٥٩]

پنتە خوێنڕێژی لە ژێر پەتەكەدا، بەڵگەیە بۆ ئەوەی كەلاشەكە بەزیندوویی خنكێنراوە، ئەشێت كە زمان و چاو دەرپەڕێتە دەرەوە، لەلاشە توێكاری‌دا تەنیا سوچی سەرەوەی كڕكڕاگەی قوڕقوڕاگە بەشكاوی ئەبینرێت[١٦٠].

٢ـ هەڵواسین (الاعدام ـ Hanging)

هەروەك سەرەوە وایە بەڵام وەك سزایەك مرۆڤەكە ئەخنكێنرێت[١٦١]

٣ـ تاوانە خنكاندن، (بەپەت)

وەك سەرەوە وایە، تەنیا ئەوە نەبێت، شوێن پەتەكە، ئاسۆیی‌یەو لەناوەندی ملدایە[١٦٢]، زیانێكی زیاتر لەكڕكڕاگەی قوڕقوڕاگە ئەدرێت و ئەشێت شوێن نینۆكی خنكێنراوەكە بەملی خۆیەوەببینرێت، كەهەوڵی‌داوە ملی لەپەتەكە دەربهێنێت.

٤- بەدەست خنکاندن.

هیچ کەسێك ناتوانێت بەدەستی خۆی خۆی بخنکێنێت لەبەر ئەمە بەدەست خنکاندن، هەموو دەم بەتاوانی (خەڵك کوژی) دائەنرێت. لەوانەیە دەستێك یان هەردوو دەست بۆئەم خنکاندنە بەکاربهێنرێت(١٦٣). هۆی مردنەکە وەك خۆخنکاندن وایە. شوێن دەست وپەنجەکان لەسەر ملی خنکێنراوەکە، بەجێئەمێنێت. ئەگەر دەستی راست بەکارهێنرا، شوێن پەنجەگەورە لەلای راست و شوێن پەنجەکانی تر لەسەر لای چەپی خنکێنراوەکە ئەبن.

ئەگەر دەستی چەپ بەکارهات، بەپێچەوانەوە ئەبینرێت.

ئەگەر خنکێنراوەکە بەئاگابوو، بەرگری لەخۆی کردبوو، ئەوا شوێن چرنوکی خۆی بەملی‌یەوە دەرئەکەوێت، کەهەوڵی‌داوە لەوچنگە خۆی رزگار بکات. جگەلەوەی ئەگەر هێندە بەهێز بێت دەستی تاوانبار لەسەر ملی بجوڵێنێت، ئەواچەند شوێن پەنجەیەك دەرئەکەوێت.

کۆبوونەوەی خوێن لەدەوری شکاوی‌یەکانی ئێسکی ژێرچەنەو کرکراگەی قورقوراگە، نیشانەی ئەوەیە کە مرۆڤەکە بەزیندوویی بەدەست خنکێنراوە. هەندێك جار شوێن ئەژنۆی تاوانبار لەسەر سنگی خنکێنراو دەرئەکەوێت یان پەراسووی ئەشکێنێت.

٥- دەم‌ولووت گرتن: هەروەك سەرەوەیە، بەلام شوێن لەپی دەستی تاوانبار لەسەر دەم‌ولێوو لووتی خنکێنراوەکە جێئەمێنێت و ئەشێت رووشانی شوێن نینۆکی خۆی وەك هەوڵێك بۆخۆرزگارکردن بەدەم و چاوی‌یەوە دەرکەوێت.

خنکانی ناوئاو:

کە مرۆڤ ئەکەوێتە ناو ئاوەوە، یان تەنیا سەری بۆ ماوەیەك لەئاودا نقوم ئەکرێت، ئەوا لەجیاتی هەوا شلە ئەچێتە ناو بۆری هەواو سیکڵدانۆچکەکان. ئەشێت تەنیا ساردو گەرمی ئاوەکە

دەماری (ویڵ) سست بکات و مرۆڤەکە بکوژێت. ئەگەر ئاوەکە سازگاربوو[١٦٤]، ئەوئاوە هەڵئەمژرێتە ناو خوێنەوەو خرۆکە سوورەکانی خوێن هەڵئەئاوسێنێت و خوێن روون ئەکاتەوە. ئەگەر ئاستی خوێی ناو خوێن پێورا ئەوا ئەبینین کەکەم ئەبێتەوە. بەڵام لەدوایی‌دا لەئەنجامی تێکشکانی خرۆکە سوورەکانی خوێنەوە (پۆتاسیۆم) لەخوێن دا بەرز ئەبێتەوە. بەڵام ئەگەر ئاوەکە سوێر بوو، ئەوا شلەی ناو خوێن رائەکێشێتە ناو سیکڵدانۆچکەکان، خوێن خەست ئەبێتەوەو ئاستی (سۆدیۆم)ی خوێن بەرز ئەکاتەوە[١٦٥]. لەئاوی سوێردا خنکاندنەکە تا نیوکاژێر دوائەکەوێت. بەڵام لەئاوی سازگاردا تەنیا لە (٢-١٥) خولەك دا، خنکاوەکە ئەمرێت.

دوور نی‌یە ئەوەی ئەکەوێتە ناو ئاوەوە؛ کەچەند جارێك لەگەڵ لنگەفرتێی خۆرزگارکردن دا سەرەدەرئەهێنێت، کەمێك ئاو بچێتە بۆری‌یەکانی هەوایەوە، بەمە ئەکەوێتە کۆکەیەکی توند، بەمە بۆری هەوا ئەگیرێت و هۆشی ئەشێوێت و بەقووتا ئەچێت و بەتەواوەتی ئەخنکێت، لەوانەیە تا گڕۆبای گەنین لاشەکە سەر ئاو ئەخات، نەبینرێتەوە.

لەبەر ئەوەی نازانرێت رووداوی خنکاندن چۆنە، ئەبێت گومان لەهەموو خنکانێکی ناو ئاو بکرێت، ئەو لاشانەی لەئاو دەرئەهێنرێن بەگشتی کۆمەڵە نیشانەیەکیان هەیە:

١ـ لاشەکە سارده وتا ماوەیەك بەساردی ئەمێنێتەوە.

٢ـ گەنینی لاشەکە بەهۆی ساردی ئاوەکەوە، دوائەکەوێت، ئەبێت پێش گەنین، بۆژەهرو شکاوی و گولله و پارچە بگەرێین.

٣ـ بەجل‌وبەرگەکەی‌دا ئەناسرێتەوە و دوورنی‌یە جلەکانی شوێن گولله یان چەقۆیەکی پێوە نەبێت!

پێستی لەپی دەست و پێ بەهۆی ئاوەکەوە، لە (٢٤) کاژێردا سپی ئەبێتەوەو ئەئاوسێت و چرچ و لۆچ ئەبێت. لەهەفتەیەك دا، سەرتوێژی پێست و نینۆکەکان دائەماڵرێت[١٦٦].

نیشانەکان:

١ـ کەف چڕین: کەفێکی سپی، یان پەمەیی، کەتێکەڵەی هەواو ئاو و مادەی چڵمی‌یە لـەلووت و دەمـەوە دێتـە دەرێ[١٦٧]. پـاش لاشەتوێکاری لەهەموو



ڕاڕەوی هەناسـەدا ئەبینرێت. ئەمەش بـە نیشـانەیەکی گرنـگ دائەنرێت، چونکە ئەوە ئەسـەلمێنێت کەبـەزیندوویی خنکاوە[١٦٨]

٢ـ ئاومشتی: لـەکاتی لنگەفرتێی خۆرزگـارکردن دا، ئەشـێت چنگی بە ڕوەکێك یاشتێك دا کردبێت. کەلەدەستی‌دا ئەمێنێتـەوە. ئەمەش بەڵگەیەکە بۆئەوەی کەبەزیندوویی کەوتۆتە ناوئاوەکە و پاشان خنکاوە.

٣ـ هەڵتۆقینی پێست: بەهۆی ساردی ئاوەکەوە، مووی پێست جگە لەبرۆوبرژانگ، ڕەپ ئەبێت و کەمێك سەلکەکەی هەڵئەتۆقێت. بەڵام ئەگەر مرۆڤەکە لەقـەراغ ئـاوێکی سـارد دا وەسـتابێت، بـێ ئەوەی بکەوێتە ئاوەکەوە، پێستەکەی هەمان شتی لێ دێت.

٤ـ هەڵئاوسـانی سـی‌یەکان: بـۆری هـەوا پـڕ ئـەبێت لـەئاو، سـیکڵدانۆچکەکان پڕئـەبن لـەئاو و هەڵئەئاوسـێن. ئەمـەش نیشانەیەکی چاکە، ئەوە ئەسەلمێنێت کە مرۆڤەکە بە زیندوویی کەوتۆتـە نـاو ئـاوەوەو خنکـاوە. لەلاشـەتوێکاری‌دا دەرئەکـەوێت کەسـی‌یەکان ئاوسـاون و شـوێن پەراسـووەکانی لەسـەر دەرئەکـەوێت. بەهەسـتی دەسـت وەك هـەویری لێ‌دێـت و پەڵـەی سووری لەسەر دەرئەکەوێت.

٥ـ پەڵـەی شـینی کـاڵ یـان سـووری کـاڵی بریقـەدار لـەژێر ڕووپۆشی سی‌یەکان دەرئەکەوێت.

ئەگەر منالێك کەوتە ناوئاوەوە، بەکپ کردنەوەی وێڵەدەمار یان بە گرژبوونی دەنگە ژێکان ئەمرێت، ئەوا ئاوناچێتە ناوسی‌یەکان و سی‌یەکان نائاوسێت و ئاووکەفی تیا نابینرێت[169]

فێدارو نەخۆش و سەرخۆش، بەرێکەوت لەئاوی کەمیش دا ئەخنکێن. ئەگەر مرۆڤەکە بەرووتی دۆزرایەوە یان جلی مەلەی لەبەردابوو، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە بەرێکەوت خنکاوە[170]

ئەگەر خنکاوەکە خۆکوژی بێت، ئەوا خۆکوژەکە گیرفانی پڕئەکات لەبەردوچەو تا قورس ببێت و سەرئاو نەکەوێت. یان دەست و قاچی ئەبەستێتەوە نەك پەشیمان بێتەوەو خۆی رزگار بکات. خۆکوژەکە هەندێك لەجل و بەرگی سەرەوەی لەووشکایی تەنیشت ئاوەکە جێئەهێڵێت و زۆر جار نووسراوێك دەربارەی خۆکوشتنەکەی بەجێ ئەهێڵێت.

بەڵام لەخنکانی بەرێکەوت دا، خنکاوەکە هەموو جلەکانی لەبەردایەو هەوڵ ئەدات خۆی بەشتێکەوە بگرێتەوە، لەبەرئەمە پارچەی ئەو شتانەی لەدەست دا ئەمێنێت. لەوانەیە برینداری خلیسکان و خزانە ناو ئاوەکەی پێوەدیار بێت.

ئەگەر لاشەکە پ 'ش کوشتن خرایە ئاوەوە، کۆمەڵێك جوداگانەی خنکانی ناو ئاوی تیا نابینرێت وەك:

١- کەف چرینی تیا نابینرێت. کەف لەبۆری‌یەکانی هەوادا نابینرێت

٢- پێستی هەڵناتۆقێت و مووی رەپ نابێت

٣- هیچ لمێك یان گژوگیایەك لەناو دەستی‌دا نابینرێت

٤- پنتە خوێنرێژی تیادەرناکەوێت[171]

٥- هیچ جیاوازییەك لەئاستی (کلۆراید) ی نێوان خوێنی لای راست و لای چەپی دڵیدا نابێت (کەئەمە لەخنکانی ناو ئاودا ئەبینرێت)[172]

**شت پەرینە ناو قورگ:**

زۆربەی بەرێکەوتە[173]. بەدەگمەن خۆکوژی یان خەڵك کوژی‌یە

زۆرتر لەمندالْ و پیردا ڕووئەدات. لەوانەیە هێندە خێرابێت و خێرا مرۆڤەکە بکوژێت، تەنیا لەکاتی لاشەتوێکاریدا[١٧٤] شتەپەڕیوەکە بدۆزرێتەوە کە مرۆڤەکەی خنکاندووەو بۆری هەوای گرتووە.

چەند لێشاوێك پنتە خوێنڕێژی لەئەنجامی تەقینی موولوولەی خوێنەوە، لەژێر پێڵووپۆش، سەردڵ و سییەکاندا دەرئەکەوێت. لە (٢-٣) خولەك دا مرۆڤەکە بێهۆش ئەبێت و لە (٤-٥) خولەکدا ئەمرێت. بێگومان لنگەفرتێی دەست و پەل وەشاندن بەوەی ئۆکسجینی زیاتری ئەوێت، مردنەکە خێرا ئەکات.

خنکاندن بەگازی خەڵوز:

گازی خەڵوز (کاربۆن مۆنۆکساید) لەئەنجامی ناتەواو سووتانی خەڵوز و نەوت و بەنزینەوە دروست ئەبێت. گەرچی جگەرە خواردنیش هێندێکی زۆر لەم گازە دروست ئەکات و لەبۆریچکەی هەواو سیکڵدانۆچکەکان دا کەڵەکە ئەبێت. ئەم گازە (٢٤٠) جار ئەوەندەی ئۆکسجین توانای یەککگرتنی لەگەڵ (هیمۆگلۆبین) ی خوێندا هەیە. بەمە کەلە سییەکانەوە ئەگاتە خوێن، شوێن بەئۆکسجین لێژ ئەکات و ناهێڵێت لەگەڵ هیمۆگلۆبینی خڕۆکە سوورەکاندا یەك بگرێت، خۆی پێکهاتووی (کاربۆکسی ـ هیمۆگلۆبین) ی لەگەڵدا دروست ئەکات. ئەم کارلێکانە لەسەرەتای هەڵمژینی گازەکەوە زۆر خێرایە، بەلاّم کاتێك ئاستی ئەم گازە لەناو خوێن و دەرەوەی لەشدا وەك یەکی لێدێت، ئیتر هێواش ئەبێتەوە[١٧٥]

تا (٨-١٠٪) ی خوێن ـ یش بەم گازە تێربێت، هیچ نیشانەیەك لەمرۆڤەکەدا دەرناکەوێت. بەلاّم کەرێژەکەی زیاتر بوو گەیشتە (٢٠٪) بۆرییەکانی خوێن فراوان ئەبن و شلەی ناویان دەست ئەکات بەدەلاّندن.

ژەهراوییەکە، کەمێك سەری دێشێت، ناوچەوانی قورس ئەبێت و چاوی ڕێشکەو پێشکە ئەکات. کەرێژەکەی گەیشتە

(٢٠-٣٠٪) مرۆڤەکــــە هەســــت بــــەبێ هـــێزی ئـــەکات، سەرولاتەنیشــتەکانی دێشـێت، هـێزی بینینــی کـەم ئەبێتــەوە. لەرێژەی (٣٠-٤٠٪) دا سەرئێشەکە قورس ئەبێت، زیاتر بێهێز ئەبێت، ئەکەوێتـە هێڵنـج و رشـانەوەو دڵـە کوتـێ، بیسـتنی وەك بینینــی کــەم ئەبێتــەوە. لــەرێژەی (٤٠-٥٠٪) دا نیشــانەکانی سەرەوە توندتر ئەبێت، هەناسە هێواش ئەبێتەوەو دڵ ئەکەوێتە پەلە، ماسولکەکان لاواز ئەبێت. لەرێژەی (٥٠-٦٠٪) دا هـۆش و ئاخاوتن ئەشێوێت، بـەگرانی ئـەجوڵێت، پاشـتر کۆڵنـج ئـەکات و هەناســە ئەشــێوێت و لەجوڵــە ئەکــەوێت. لــە (٦٠-٧٠٪) دا نیشانەکانی سەرەوە زۆرتوند ئەبن، لەوانەیە هەندێکیان بمرن.

گەر لـێرەدا لـەو هەوایـە دوورخرایـەوە و چارەکرا ئـەوا چـاك ئەبێتەوە. ئەگەر گازاوی‌یەکە بەزیندوویی مایەوە تا رێژەی گازەکە بگاتـە سـەر (٨٠٪) ئـەوا لێدانـی دڵ زۆر کـز ئـەبێت، هەناسـە ئەوەستێت و ئەمرێت[١٧٦]

نیشانەکانی لاشەتوێکاری

رەنگی خنکاوەکە، پەمەیی‌یەکی سووربـاوە، (ئەمـەش رەنگـی کاربۆکسـی هیمۆگلۆبـین)ـە. گـەر خوێـن تێکـەڵ بەسـۆدەی داخ (NaoH) کـرا، هـەر بـەرەنگی پەمـەیی سووربـاو ئەمێنێتـەوە، بـەڵام خوێنی مردووی تر (سەوز) ئەبێت.

ئەم گـازەش، تەنانـەت دوای گـەنینی لاشـەکەش، لـە لـەش دا ئەمێنێتـەوەو ئـەتوانرێت ئاسـتەکەی بپێورێـت. ئـەوەشمان لـەبیر نەچێت، کەئـەم گـازە کـە لەلـەش دا دروسـت نـابێت و گڕوگـازی گەنین ئەم گازەی تیانی‌یە. دۆزینـەوەی ئـەم گازە بەهـەر ئاسـتێك لـەبۆری هـەوای مردوویـەکدا نیشـانەیەکە، بـۆ ئـەوەی بـەم گـازە خنکاوە.

ئــەوەش مــاوە بڵێــین ئــەم خنکاوانــە نیشــانە گشــتی‌یەکانی خنکانیان تیا ئەبینرێت.

بەشی نۆیەم

# مەرگــی چاوەڕوان نەکــراو
# "مەرگی کتوپڕ"

مردنـی کتوپـڕ: بریتی‌یە لەو مردنـەی لـەپڕ، مرۆڤێـك ئـەدات بەزەوی‌دا، زۆرجار ئەم مردنە ئەنجامی نەخۆشی‌یەکە، کەبـەرەفتار و روخساری مرۆڤەکەوە دیارنی‌یە. وەك ئەوەی یەکێك لەکاتی نان خواردن، رۆیشتن یان ئاخاوتندا لار ئەبێتەوەو ئەمرێت. یان لەناو جێگەدا ئەمرێت.

ئـەم هــەموو جـۆرە مردنـە کتوپڕانــە ئـەبێت بنـێردرێن بـۆ پزیشکی‌ی دادوەری بۆ لاشە توێکاری، تا هۆی مردنەکە بزانرێت و نـەبێت بـە مەتـەڵ و چیرۆکی لێ نەکەوێتـەوە، هەرلایـەش مـافی خۆی وەرگرێت.

مردنـی کتوپــڕی چـاوەڕێکراو: دکتــۆر چـاوەڕێی مردنــی نەخۆشـەکەی ئـەکات، لەبەرئـەوەی نەخۆشــی‌یەکی سـەخت وەك (لێدانی تیژی دڵی - جلطة قلبية حادە) یـان (مێشکە پەردەسۆ - التـهاب السـحايا) ی هەیـە. یـان نەوزادێکـە و کـەم و کوڕی‌یــەکی گەورەی لە کۆئەندامێکی کاریگەری وەك هەناسە، سووڕی خوێن یان دەماردا یە.

مردنـی کتوپـڕی چـاوەڕێ نـەکراو: پزیشـك بەتـەمای مردنــی نەخۆشــەکەی نـەبووە[١٧٧] و بەپێچەوانــەوە، بـاری تەندروســتی نەخۆشـەکەی بـەرەو باشـی و باشتر چووە، لەپڕ ئـەمرێت ئەمـەش ئەشێت ماکی نەخۆشی‌یەکە بێت، یان ماکی مانـەوەی نەخۆشـەکە بێت لەجێگەدا وەك مردن بە (دەمەوانەی سی - الجلطة الرئوية - Pulmonary Embolism) کەپاش نەشـتەرگەرییەکی سـەرکەوتوو،

لەپڕ بمرێت. یان نەخۆشێك پاش لێدان ـ نۆرەـ ی دڵـی، بـەرەو باشی ئەچێت و لەپڕ جارێکی تر تووشی (نۆرە)یەکی تر ئـەبێت و ئەمرێت. هۆی ئەم مردنانە تەنیا پاش لاشەتوێکاری روون ئەبنەوە

مردنـی هۆنادیـار: وەا ئـەوەی مرۆڤێـك کەنـەخۆش ئەکـەوێت، پێـش زانینـی هـ... نەخ...ـی یەکە، ئـەمرێت. لەوانەیـە پـاش توێ...ی مۆکـەی هـەر نـەزانرێت و ئـەم جـۆرە دەگمەنـە (٥٪) ی هەموو مردنەکە کتوپڕی‌یەکان ئەگرێتەوە.

لەم جـۆرە مردنەکتوپڕی‌یانـەدا، لەبەرئـەم هۆیانـەی خـوارەوە، ئەبێت بە هیچ جۆرێك، لاشەکە بێتوێکـاری، نەدرێتـەوە بەکـەس و کاری:

١ـ تا رێ لەهەموو جۆرە ر...خنەو پلارێك بگیرێت.

٢ـتـا هیـچ گوم...انێکی تاوانکـاری لەکێشـەی مردنەکـەدا نەمێ...

٣ـ زانینی هۆی مردنەکە، یارمەتی‌یەکە بۆ دامەزراندنی (ئامار ـ الاحصا ء) یەکی ... ی مردنە کتو پڕی‌یەکان.

لـەم کاتانـەدا پزیش...ی دادوەر بـەدوای هـەموو نیشـانەیەك دا ئەگەڕێت، گوما... زەبری دەرەکی، بریـن، شین بوونـەوە، کوتـران، خوێنە گمۆڵ ... هتد. پاشان سەر، سنگی مردووەکە ئەکاتەوە؛

- لەسـەردا ... وای لێدانـی مێشـك، خوێـنڕێژی، پەردەسـۆ، ... هتـ...ا ئەگەڕێت.

... سنگ دا ...دوای لێدانی دڵی، مردنی دڵە ماسولکە، دڵە پە...سۆ، دەمەوانەی خوێنبەری دڵ، کۆبونـەوەی خوێن یـان کێم لە دڵە پەردەدا، پنتـە خوێـنڕێژی (Petichiae)، نەخۆشـی‌یەکانی سی و بۆری هەوا، گیرانی بۆری هەوا، سی‌پۆشە سۆ (ذات الجنب ـ plurisy)، کۆبوونەوەی خوێن و شلە و کێم لەسی‌پۆشە پەردەدا، دەمەوانەی خوێنبەری سی‌یەکان ... هتد دا ئەگەڕێت.

ئەگـەر ئەمانـەی نەدۆزی‌یـەوە، سـك ئەكاتـەوە، بۆدۆزینـــەوەی نەخۆشـی‌یەكی كوشـندە، خوێـنرێزی .. هتـد، ئەگـەر هیچـی بـۆ نەدۆزرایـەوە، ئەبێت نموونە لـە گەدە، ریخۆڵـەكان، جگـەر، سـپڵ، خوێـن، گورچیلـەكان، دڵ بەخوێنەكەیـەوە... هتــد وەربگـیرێت و بینێرێت بۆ ئامۆژگای پزیشكی‌ی دادوەری، لەم قۆناغەدا پزیشكی دادوەر ئەتوانێت (مـەرگ نامـە ـ شهادە الوفاة)[178] بـۆ مردووەكـە پڕبكاتەوەو لەشوێنی هۆی راستەقینەی مردندا بنووسێت (مردنی گومان لێكراو، چی پێویست بووكرا ـ موت مشتبە فیە وقد اجری الـلازم) پـاش هاتنــەوەی ئەنجامەكـە لـە ئامۆژگـای پزیشـكی‌ی دادوەری‌یـەوە، ئەگـەر هۆكـەی هـەر نەزانرا، ئـەوا (مـەرگ نامـە) ی ئەدرێتێ و بنووسرێت (مردنی هۆنادیار ـ موت لم یشخص سببە)

لەبـەر ئـەوەی هـۆی ئـەم مردنـە كت‌وپڕانـە بـەپێ‌ی تەمــەن، ئەگۆڕێت، وا بـەباش ئـەزانین، لەژێر چـەند سـەردێرێك دا باسـیان بكەین:

یـەك ـ مردنـی كت‌وپـڕی نـەوزاد و سـاوا (المـوت المفـاجئ في حدیثي‌الولادة و الرضع)

أ ـ زەبری زان (كلم الولادە ـ Trauma of Labour)[179]

هۆكانی: لەدایك بوونی سەخت، وەك ئەوەی نەوزادەكە بەسمت یـان بەشـان دا بێـت. پێویسـتی بـە هەڵگەڕانـەوەو راكێشــان و دەسـكاری بێت. مامـانی نـەزان، زەبـر بەسـەر یـان لەشـی منداڵەكـە ئەگەیەنێت.

نیشـانەكانی: برینـداری، شین بوونـەوە، كوتـران، یـان تا لاشـە توێكاری هیچ نیشانەیەكی لێ دەرناكەوێت[180]

ئەنجامی لاشە توێكاری:

ـ خوێنرێزی وخوێنە گمۆڵی دەر یان ژێر تورتە پەردە.

ـ كوتران و برینداری دەماخ

- شكان و لەجێچوونی بڕبڕەی مل و پەتكەدەمار[181]
- هەناوێك، وەك سپڵ، جگەر، ئەتەقێت یان بریندار ئەبێت.
ب ـ نەخۆشی:
نەخۆشی زگماك ـ هاوزایین (الخلقیە ـ Congenital)ـەكان:
وەك:
- بێسەری، ئاوسان و زەردوویی خوێن جیایی باوكو دایك
- ناسۆری بۆری هەوا ـ سورێنچك، كەموكوڕی دڵ.
نەخۆشی دەستكەوتە:
وەك: مێشكەپەردەسۆ، بۆری هەواسۆ، قوڕقوڕاگەسۆ.
ج ـ مەرگی ناوجێ (Cod death)[182]
لە (٥٠٠) ساوا یەكێكیان[183] لەتەمەنی (٤-١٢) مانگی[184]، بەم شێوەیە ئەمرن:

ساواكە پێش مردنەكەی تەندروستە یان لەوە ئەچێت سووكە سەرمایەكی بووبێت. شەو پاش شیردان، ئەخەوێنرێت. بەیانی لەجێگەكەیدا بەمردوویی (زۆرینەی) لەپەوڕوو ئەبینرێن. گەرچی هۆكەی نەزانراوە، بەلام پاش (لاشەتوێكاری ـــ Autopsy) دەرئەكەوێت كە (سییەسۆ) یەكی زۆر توندی هەبووە. ئەشێت كەمێك لەشیرەكەی هەڵ هێنابێتەوەو چووبێتە ناو بۆری هەواو سییەكانی، تووشی سووتانەوەو (فرەهەستیاری ــ حساسیە ــ Allergy) یەكی توندی كردبێت[185]

ئەم مردنە، كۆمەڵە جوداگانەیەكی هەیە:
١ـ لەخەودا، لەبەرەبەیان دا ڕوودەدات
٢ـ لەنەوزادو ساوای نەباكام (پێش وەخت ـ Immature) دا پترە. بەتایبەتی ئەوانەی كێشی لەشیان كەمە. دووانە (٢-٥) جار لەتاكە زۆرتر ڕووئەدات.
٣ـ كەمێك لەنیوەی زیاتر نێرینەن.

٤ـ لەسەرەتای بەهار و پایزدا بڵاوترە.
٥ـ لەخێزانە هەژارەکاندا بڵاوترە.
٦ـ لەتەمەنی نێوان (١-٨) مانگ، بەتایبەتی (٣) مانگیدا پترە[١٨٦]

دوو: مەرگی کتوپڕی مێردمناڵ تا تەمەنی (٢٠) ساڵی:
ئەم هۆسەرەکیانەی هەیە:
١ـ نەخۆشی‌یە (هاوزاین)ـەکان؛ وەك نەخۆشی‌یەکانی دڵ و خوێن
٢ـ نەخۆشی‌یە دەستکەوتەکان، وەك نەخۆشی‌یەکانی دڵ و هەناسەو کۆئەندامی دەمار
٣ـ کۆنیشانەی منالّی لێدراو (Child abuse syndrom)
باوان یان خێوی منالّەکە، بەردەوام توندوتیژن، منالّەکە بریندار ئەکەن، ئێسقانەکانی ئەشکێنن. ئەگەر یەکێك ئەم لێدانە رانەگرێت، ئەوا لە (٦٠٪) یاندا دووبارە ئەبێتەوەو (١٠٪) یان ئەمرن[١٨٧]. هۆی مردنەکەش بریتی‌یە لەخوێنڕێزی ژێر تورتەپەردە، تەقینی سپڵ و جگەر.
ئەم کۆنیشانەیە، کۆمەڵە نیشانەیەکە؛ کە پێکەوە ئەبینرێن:
١ـ شین بوونەوەی دەموچاو، دەوری ئانیشك و ئەژنۆ، مەچەك و مل، سەرسنگ، سك بەتیرەی (١سم) ئەمەش شوێن پەنجەی ئەو کەسەیە کە ئازاری منالّەکەی داوە.
٢ـ شین بوونەوەی دەمولێو، برینداری ناودەم، برینداری لێوگر (Frenulum) ی سەرەوە
٣ـ شین بوونەوەی گوێی دەرەوە، پێستە سەر و برینداری چاو
٤ـ شکان (شکاوی)

٥ـ برینداری جۆراوجۆری وەك سووتاندن، داخ کردن، پلیشاندنەوەی پەنجە.

بۆ پشکنینی ئەم منالانە، ئەبێت بەوردی[١٨٨]:

١ـ چاویان لەلایەن پسپۆری نەخۆشی‌یەکانی چاوەوە بپشکنرێت بۆ دۆزینەوەی:

- خوێنرێزی ناوچاو.
- خزانی هاوێنەی چاو (Dislocation of the lense).
- جیابوونەوەی تۆڕەی چاو.
- کوێری.

٢ـ ئێکسەبەرداری سەرو پەلەکان بگیرێت.

سێ: مردنی کت وپڕی پێگەیشتووان (گەورەسالان)

ناسینەوەی نەخۆشی لەم تەمەنەدا، لەچاو ساواو منالاندا ئاسانترە[١٨٩] بەلام ناساغی و نەخۆشی‌یەکانی زۆرترە، جگەلەوەی کەدووچاری ژەهراوی‌بوون و کێشەی کۆمەلایەتی و دەروونی ئەبن

١ـ تەمەنی (٢٠–٤٠) سالی:

نەخۆشی‌یە کوشندەکانی وەك:

أ ـ گۆپکە خوێنبەر (Aneurysm)

وەك گۆپکە خوێنبەری مێشك (Berry Aneurysm) لەئەنجامی هەلچوون و توڕەبوون و ماندوو بوونەوە، ئەتەقێت و نەخۆشەکە بێ‌هۆش ئەکات، یان یەکسەر ئەیکوژێت. ئەمەش لەلاشەتوێکاری‌دا بەئاسانی ئەدۆزرێتەوە.

ب ـ دوومەلی مێشك: کەلەپڕ ئەتەقێتە یەکێك لە (زگۆلە ـ ventricle)ـەکانی مێشك و نەخۆشەکە ئەکوژێت

ج ـ پەرکەم (Epilepsy): پاش ئەوەی پەرکەمەکەی لێ دێت، ئەشێت لە ئاوێکی کەمدا بخنکێت. یان لەپەوڕوو بێ‌هۆش بکەوێت و دەم‌ولووتی بچەقێتە نوێن یان ئەوشوێنەی لێی

ج ـ پەرکەم (Epilepsy): پاش ئەوەی پەرکەمەکەی لێ دێت، ئەشێت لە ئاوێکی کەمدا بخنکێت. یان لەپەوڕوو بێهۆش بکەوێت و دەمولووتی بچەقێتە نوێن یان ئەوشوێنەی لێی ئەکەوێت. یان پەرکەمەکە ئەبێتە هۆی کرژییەکی بەردەوامی ماسولکەکانی هەناسەدان و ئەیکوژێت

د ـ نەخۆشییەکانی دڵ: تەسک بوونەوەو گیرانی خوێنبەرەکانی دڵ ئەبنەهۆی (نۆرەی دڵی ـ الجلطة القلبیه)

٢ـ تەمەنی پاش (٤٠)ساڵی:

ئەمەش کۆمەڵێك نەخۆشی تایبەتی ئەگرێتەوە وەك[١٩٠]:

- خوێنرێژی خوێنبەری مێشك، دەمەوانەی خوێنبەری مێشك.
- تەسك بوونەوەو گیرانی خوێنبەری دڵ.
- دڵە ماسولکەسۆ (التهاب العضلات القلبیه ـ Myocarditis).
- تەسکی زمانەی دووانەی دڵ (Mitral Stenosis).
- تەقینی گۆپکەی شاخوێنبەر.
- دەمەوانەی خوێنبەری سییەکان.
- خوێن کۆکین ... وەك سیلی سی.
- خوێن رشانەوە وەك: هەوی سورێنچك، گەدەو دوانزەگرێ

## پشکنینی شلەی لەش و پاشکۆکانی پێست

پشکنینی شلەکانی لەش و پاشکۆکانی پێست، بەڵگەو ڕێ پیشاندەرن بۆ سەلماندن یان نەسەلماندنی تاوان و دەست درێژی.

خوێن: هەندێك جار پەڵەیەك یان هەندێك خوێن لەشوێنی ڕووداوەوە یان لەسەر لاشەی قوربانی یان لەسەرجلی گومانلێکراوێکەوە ئەنێردرێت بۆ پشکنین. ئەگەر بەم شێوەیەی باسی ئەکەین بپشکنرێت، ئەوا ئەگەر جل وبەرگ یان ڕاخەرەکەش شۆردرابێت، ئەوا هەر ئەتوانرێت خوێنەکە بناسرێتەوە.

لەزیندوودا خوێن بۆ جۆری خوێن، ژەهراوی بوون، ئاستی ئەلکهول ئەپشکنرێت. لەمردوودا بۆهەمان مەبەستی سەرەوە، سوودی لێ وەرئەگیرێت.



بۆ دۆزینەوەی جۆر (گروپ) ی خوێن، هێندێکی کەم خوێن پێویستە، بەڵام بۆ ژەهراوی بوون و ئاستی ئەلکهول بەلای کەمەوە (١٠سی‌سی) مان ئەوێت. بۆ پێوانی ئاستی ئەلکهول، ئەبێت خوێن لە خوێنهێنەری پەلەکانەوە وەربگیرێت[١٩١]، چونکە لەمردوودا وەك بەشێك لە پرۆسێسی گەنین، هەندێك ئەلکهول لەجگەردا دروست ئەبێت و ئەگەر لەدڵەوە خوێنەکە وەرگیرا ئەوا ئەم ئەلکهولە دروست بووە، دەرەنجامەکە ئەشێوێنێت.

کەخوێنەکـە وەرگـیرا، ئـەبێت شووشـەیەکی سـەرقەپاتی لێ پــڕ بکرێت. تا ئەلکهولەکە نەبێت بە هەڵم[١٩٢]

بەڵام بۆ ژەهراوی بـوون، خوێنەکـە لەهەرکوێیـەك وەربگـیرێت وەك یەکـە. بـۆ پشـکنینی ژەهــراوی بــوون بــە (CO) ئــەبێت شووشـەیەکی سـەرقەپات پڕبکرێــت. تـا گازەکـە جیانەبێتــەوەو دەرەنجامەکەمان نەشێوێنێت.

ئایا خوێنە؟



بۆوەڵامـی ئـەم پرسـیارە، تاقیکردنـــــــەوەی (پیرۆکســــایدەز ـــــ Peroxidase) ئەکــــەین؛ شــلەکە یــان گــیراوەی تــــۆزی پەڵەکـــــە، لـەناوەندێکی (تفــت) دا تێکـەڵ بـە (فینولفتـالین) ئـەکرێت. ئەگــەر خوێــن بێـت، ڕەنگـی گیراوەکـە ئـەبێت بـە (مۆرێکـی کـاڵ) ئەگـەر ڕەنگـی نەگۆڕا، ئەوا خوێن نی‌یە.

کەرەنگی گیراوەکە گۆڕا؛ ئەوسا گیراوەکە لەژێر وردبین دا تاقی ئەکەینەوە. تەنانەت لە خوێنی وشکەوەبووشدا، خرۆکەی سوری خوێن (RBC) ئەناسرێتەوە، ئەگەر خانەی ساغی تێکنەشـکاوی تیابوو، ئەتوانرێت (گروپ ـ جۆر) ی خوێنەکەی لێوە بدۆزینەوە. ئەگەر خوێنەکە، خوێنـی بێ نوێـژی (الطمث) بێـت، ئـەوا هـەندێك خانەی ناوپۆشی مناڵدانی تیا ئەبینرێت.

لەپشکنینی خانـەی سپی خوێن (WBC) و دۆزینـەوەی تـەنی (Barr)ـەوە ئـەتوانین بیسـەلمێنین کە خوێنەکـە خوێنـی نێرینەیـە

یان مێیینه (ئەم تەنی (بار)ـە لەمێیینەدا نییە) جگە لەوەی لەژماردنی کرۆمۆسۆمەکانەوە لەوخانانەی لە دابەش بوون (Division) دان ئەتوانرێت بەپێی (xx,xy) بزانرێت کە خاوەنەکەی نێرە یان مێ؟ [١٩٤]

ڕێگەیەکی تریش هەیە بۆ سەلماندنی خوێنێتی شلە یان گیراوەکە، پێی ئەوترێت تاقیکردنەوەی (تاکایاما ـ Takayama). چەند دڵۆپێك لەگیراوەی تاکایاما ئەکرێتە سەر گیراوە یان تۆزی ئەو شتەی بە خوێنی ئەزانین، لەسەر سلایدێك، پاش پێنج خولەك لەژێر وردبین دا ئەیپشکنین. ئەگەر خوێن بێت؛ کۆمەڵێك کریستاڵی تیسك داری پەمەیی (هیمۆکرومۆجین) ی تیائەبینین. بەڵام ئەگەر خوێن نەبێت، ئەم کریستاڵانە نابینرێن.

ئایا خوێنی مرۆڤە؟

گەرچی بەشێوەو قەبارەدا خرۆکە سوورەکانی مرۆڤ ئەناسرێتەوە، بەڵام بۆ تەواو سەلماندن، تاقیکردنەوەی (نیشتن ـ pricipitation) ی بۆ ئەکەین. [١٩٥] هەندێك زەرداوی خوێنی کەروێشك (کەلەوەوبەر خوێنی مرۆڤی کرابێتە لەش) تێکەڵ بەگیراوەی خوێنەکە ئەکەین. ئەگەر خوێنی مرۆڤ بێت، ئەوا تێکەڵەکە تەماوی و لیڵ ئەبێت.

ئایا خوێنی گومان لێکراوە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، پشت بە جۆری خوێنەکە ئەبەستین. ئایا کام لە (ABO)ـەیە ئایا (RH) ی هەیە یان نە ء. جگە لەم دوو کۆمەڵەیە، چەند گروپێکی تری وەك (MN) ، (نویس) ، (کیل) و (دەفی) یە، کەبەم پێیە ئەتوانرێت خاوەن خوێنەکە لەناو کۆمەڵێك گومان لێکراودا بدۆزرێتەوە.

تۆوا:

لەزیندوودا، بەدەستپەڕ (Masturbation)[١٩٦]، بەدەست دێت، یـان لەسـەر دەرپـێی گومـانلێکراو لـەتاوانی سـواربوون و هەتیوبازی، یان لەناو (میزەجۆ ـ الاحلیل ـ urethra) یان (کیلەك ـ المهبل ـ Vagina) یـان (کـۆم ـ الشرج ـ Anus) دا ئەدۆزرێتەوە و ئەنێردرێت بۆ پشکنین.

بـۆ سـەلماندنی (پیاوەتی ـ potency) و (نـەزۆکی ـ Sterility) یەکسەر پاش وەرگرتنی ئەبێت بنێردرێت بۆ تاقیکردنەوە.

لـەکاتی وەرگرتنـی (سـڕین ـ المسـحە) لەکیلـەك و مـیزەجۆو کۆمەوە، پێش ئەوەی پەنجە لەو ناوچانە بدرێت، بەهۆی چیلکەو لۆکەوە، ناوچەکە ئەسڕێت و ئەخرێتە سەر ناوەراستی (سـلاید) ێك و پاش وشك کردنەوە، نـاو و کـات و شـوێنی لێ وەرگیراوی لێ ئەنووسرێت و ئەنێردرێت بۆ تاقیگا[١٩٧].

هەندێك جار جل‌وبەرگی تاوانبار یـان گومانلێکراو ئەنێردرێت بـۆ پشـکنینی تـۆواو. ئەگـەر ئـەم جلانـە خرانـە ژێـر تیشـکی سەروبنەوشـەیی‌یەوە[١٩٨]، شـوێن تۆواوەکـە، وەك پەڵـەی سـپی لەسەر جل و بەرگەکە دەرئەکەوێت[١٩٩].

ئەتوانین شوێن پەڵەکە ببڕین و لەسـەرخۆ لە (٣٠سی‌سی) ئـاو یـان خوێیـاودا هـەڵی‌پروێنین و یـەك دڵـۆپ ترشـی (HCL) ی تێکەڵ بکەین، پاش چەند کاژێرێك، کەمێکی بخەینە سەر (سلاید) ێك، کەوشك بووەوە یەك دڵۆپ گیراوەی (فلۆرسـن) )٣٠سی‌سـی ئاو، ١,٥گم پۆتاسیۆم ئایۆداید، ٢,٥گم ئایۆدین) ی بکەینە سەر و دایپۆشین و لەژێر وردبیندا سەیری بکەین. ئەگەر تۆواوی تیابێت ئەوا کۆمەڵێك کریستاڵی قاوەیی (تۆخ) ی تیا ئەبینرێت[٢٠٠].

ئەگەر بمانەوێ بەدوای (تۆو ـ حیـامن ـ sperm) دا بگـەڕێین، ئەوا شلەکە لەگەڵ کەمێك (میثیلین) ی شین دا لەسەر (سلاید) ێك تێکەڵ ئەکەین، لەسەر ئاگرێکی کز وشکی ئەکەینەوە. پاش (٢٠)

خولەك بەئاو ئەیشۆین، هەندێك رەنگی (ئایۆسین) ی تێئەل ئەكەین و لەژێر وردبیندا، بە بەهێزترین چاوی سەیری ئەكەین

تۆو نزیكەی (٠,٠٥٥ ملم) واتە (هێندەی تیرەی هەشت خرۆكەی سووری خوێن) ئەبێت و لە (سەرومل و كلك) پێك دێت سەر ١/١٠ ی درێژی‌یەكەیەتی. مادەی (ئەسید فۆسفاتەیز - Acid phosphatase) بەزۆری لە تۆواوی مرۆڤدا هەیەو (٢٥٠٠) جار هێندەی تۆواوی هەر ئاژەڵێكی تری تیایە. بەپێوانی هێندی ئەم مادەیە ئەتوانرێت بسەلمێنرێت كەتۆواوەكە هی مرۆڤە یان نە ء.

ئەبێت ئەوەمان لەیاد نەچێت كە ئەگەر (سڕین)ەكە لە میزەجۆ یان (كۆم)ەوە وەرگیرا، پێش میزكردن و پیسایی كردن وەربگیرێت دەنا میزوپیسایی كردن دەرەنجامەكان ئەشێوێنن و تۆواوەكەمان لەكیس ئەدەن[٢٠١].

لیك‌و رشانەوەو پیسایی و موو و نینۆك

ئەبێت ئەم دەردراوانەی مردوو یان ژەهراوی بوو، بپارێزرێت و بنێردرێت بۆ پشكنین، چونكە زۆر ژەهر هەیە كەلەم دەردراوانەدا ئەدۆزرێتەوە.

نینۆك: لەوەمردووانەی گومانی ژەهراوی بوونیان لێئەكرێت بەژەهرە كانزایی‌یەكانی وەك (زەرنیخ و قورقوشم) ئەنێردرێت بۆ پشكنین.

موو: لەزۆر شوێن دا ئەدۆزرێتەوە، وەك[٢٠٢]

١- شوێنی رووداني تاوانەكە

٢- لەسەرجل و ژێر نینۆكی مردووەكە

٣- لەسەرئەندامی سێكس و دەرپێی تاوانبار و نێچیرەكەوە.

٤- هەندێك جار لەلایەن سكاڵادارەوە (خاوەن سكاڵا) وە، پێش كەش ئەكرێت. مووەكە ئەخرێتە قووتوویەكی باغەوە یان لەسەر

کاغەزێك بە (تێپ) جێگیر ئەکرێت. بەشێوەیەك سەرە بەرەلاکەی دیاری بکرێت.



موو جگە لەوەی بەچاو ئەپشکنرێت، ئەتوانرێت درێژی و جۆرو رەنگی بناسرێتەوە. هەروەها لەژێر وردبین دا، لەگەڵ مووی گومانلێکراودا بەراورد ئەکرێت. جگە لەوەی ئەتوانرێت هەندێك ژەهری کانزایی وەك (زەرنیخ و قورقوشم) ی تیا بدۆزرێتەوە.

## بەشی یانزەیەم

# تاوانە سێکسی‌یەکان

تاوانە سێکسی‌یەکان لەپێودانگی یاساوە ئەکرێن بەچەند بەشێکەوە:

**بەزۆرسوار بوون (الاغتصاب ـ Rape)**

سواربوونی مێینەیەك، بێ‌ویستی خۆی (بەزۆر)، دەرلەپێوەندیی ژن‌و مێردایەتی بە (بەزۆر سوار بوون) دائەنرێت.

**داوێن پیسی (الزنا ـ Sexual act )**

ئەم تاوانە بەویستی هەردوولایە، بەمەرجێك نێرینەکە بزانێت کە مێینەکە ژنی مێردارە. یان ئەگەر پیاوێك لەماڵی خۆی و ژنەکەی‌دا داوێن پیسی لەگەڵ مێینەیەك دا بکات.

**رەفتاری ناشیرین (الفعل المخل بالحیا ء)**

هەر رەفتارێك لەگەڵ کۆمەڵەکەدا نەشێت، ناشیرین بێت، بەبێ ویستی بەرامبەرەکە (نێربێت یان مێ) بکرێت.

**پاشە سواری (اللوط ـ Anal Act)**

ئەمەش کرداری سێکسی‌یە، لەرێی (کۆم)ـەوە، جالەگەڵ نێرینە یان مێینەدا بکرێت[٢٠٤]

**چەند دەقێکی یاسایی**

لەخوارەوە چەند بەندێکی یاسایی سزادانی عێراقی ئەخەینە روو کە پەیوەندیی‌یان بەتاوانە سێکسی‌یەکانەوە هەیە:

**بەندی (٣٧٧)**

داوێن پیسان سزا ئەدرێن. ئەگەر نێرەکە زانی بەرامبەرەکەی ژنی مێرددارە یان هەرپیاوێك لەماڵی خۆی‌دا داوێن پیسی بکات سزا ئەدرێت.

بەندی (٣٧٨)

١ـ هیچ سکالایەك دەربارەی داوێن پیسی نابینرێت، ئەو سکالایانە نەبێت لەلایەن ژن یان مێردی داوێن پیسەکەوە پێشکەش ئەکرێت. هەروەها لەم بارانەی خوارەوەدا سکالاکان نابینرێن:

أ ـ ئەگەر سێ مانگ پاش زانینی بە کێشەکە، ژن یان مێرد سکالای کرد.

ب ـ ئەگەر خاوەن سکالاکە، لەگەڵ تاوانەکەشدا، ئامادەبێت و بیەوێت ژیانی ژن و مێردایەتی بەردەوام بێت.

ج ـ ئەگەر دەرکەوت، کەداوێن پیسی یەکە بەویستی خاوەن سکالاکە بووو.

٢ـ مەبەستمان لەژن ومێرد، ئەو کەسانەیە کاتی رووداوەکە ژن ومێرد بووبن، ئەگەرچی دواتریش لەیەك جیابووبنەوە.

پیاو تاچوار مانگ پاش جیابوونەوە بۆی هەیە سکالا لە داوێن پیسی ژنەکەی بکات.

بەندی(٣٧٩)

١ـ ئەگەر خاوەن سکالاکە مرد یان وازی لەسکالاکەی هێنا، یان پێش دەرچوونی بڕیاری دادگا، ژنەکەی هێنایەوە و بوونەوە بەیەك، ئەوا سکالاکە پشت گوێ ئەخرێت. واز هێنانی مێرد لەسکالای دژ بە ژنەکەی، بەواز هێنان دائەنرێت لەدوای دادگایی کردنی دۆستی ژنەکەی.

٢ـ مێرد ئەتوانێت سکالاکەی رابگرێت، ئەگەر مرد منداڵەکانی ئەتوانن سکالاکە رابگرن.

بەندی (٣٩٣)

١ـ هەرکەسێك بەزۆر سواری نێرینە یان مێینەیەك بێت، ماوەیەك کەلە (١٥) ساڵ زیاتر نەبێت، بەند ئەکرێت.

٢ـ سزاكه توندتر ئەبێت:

ا ـ ئەگەر قوربانی‌یەکە لە تەمەنی (١٨) ساڵ کەمتر بێت.

ب ـ ئەگەر تاوانبار تاپلەی (سێ) خزمی قوربانی‌یەکە بێت، یان چاودێری، پەروەردەی قوربانی‌یەکەی پێ‌سپێردرابێت، دەستی بەسەردا بڕوات یان ئەگەر نۆکەر یان خزمەتکاری خۆی یان خزمێکی (تاپلە سێ)ی بێت.

ج ـ ئەگەر تاوانبار کارمەندێکی خزمەتگوزارە گشتی‌یەکان، پیاوی ئایینی یان پزیشک بێت، کەبڕواپێ بوونی پیشەکەی بۆ ئەنجام دانی تاوانەکە بەکار هێنابێت.

د ــ ئەگەر دووکەس یان پتر بەشدار بن لەتاوانەکەدا، بۆبێ‌دەسەڵات کردنی قوربانی‌یەکە یان یەك لەدوای یەك توخنی قوربانی‌یەکە بکەون.

هـ ـ ئەگەر قوربانی‌یەکە تووشی نەخۆشی‌یەکی سێکسی بوو

و ـ ئەگەر قوربانی‌یەکە (بێ‌بن) بوو یان (سکی پڕ) بوو.

٣ـ ئەگەر تاوانەکە بووە هۆی مردنی قوربانی‌یەکە، ئەوا هەتا هەتایی زیندان ئەکرێت.

٤ـ ئەگەر قوربانی‌یەکە کچ بوو، ئەوا دادگا ئەبێت لەبری خستنێکی شیاوی بۆ دابنێت.

بەندی(٣٩٤)

١ـ هەرکەسێك، گەرچی بەویستی هەردوولاش بێت، سواری نێرینەیەك یان مێینەیەك ببێت کەپانزە ساڵی تەواو کردبێت و تەمەنی نەبووبێت بە هەژدە ساڵ، ئەوا ماوەیەك بەند ئەکرێت کەلەحەوت ساڵ زیاتر نەبێت.

٢ـ ئەگەر قوربانی‌یەکە لەتەمەنی (١٥)ساڵ بچوکتر بێت یان پانزەساڵی تەواونەکردبێت، ئەوا تاوانبار ماوەیەك بەند ئەکرێت کەلە (١٠) ساڵ پترنەبێت.

٣ـ سزاكە توندتر ئەبێت ئەگەر يەكێك لەخاڵەكانى برگەى (٢) ى بەندى (٣٩٣) ى تيابێت.

٤ـ ئەگەر قوربانىيەكە كچ بوو، ئەوا دادگا ئەبێت لەبرى خستنێكى شياوى بۆ دابنێت.

بەندى (٣٩٦)

١ـ هەركەسێك بەزۆر يان بەهەرەشە يان بەفێڵ يان بەهەرشێوەيەكى تر دژ بەويستى قوربانىيەكە، هەوڵ بدات يان سوارى نێرينە يان مێينەيەك ببێت. ئەوا ماوەيەك بەند ئەكرێت كەلە (٧) ساڵ پترنەبێت.

٢ـ ئەگەر تەمەنى قوربانىيەكە لە (١٨) ساڵ كەمتر بێت، يان تاوانبار يەكێك لەخاڵەكانى برگەى (٢) ى بەندى (٣٩٣) بيگرێتەوە، ئەوا ماوەيەك زيندان ئەكرێت كەلە (١٠) ساڵ پتر نەبێت.

بەندى (٣٩٧)

ئەگەر يەكێك سوارى نێرێك يان مێيەك بێت. تەمەنى (١٨) ساڵى تەواو نەكردبێت، گەربەويستى قوربانييەكەش بێت، بەند ئەكرێت.

ئەگەر تاوانبار خاڵێكى برگە (٢) ى بەندى (٣٩٣) بيگرێتەوە، ئەوا ماوەيەك بەند ئەكرێت لە (٧) ساڵ پتر نەبێت.

بەندى (٣٩٨)

ئەگەر تاوانبارێك بەپێى ژنهێنان نامەيەكى دروست قوربانىيەكەى هێنا، ئەوا سكاڵاكە پشت گوێ ئەخرێت. بەڵام ئەگەر لەژنەكە جيابووەوە، ئەوا سزاكان دەست پێئەكاتەوە ئەگەر تاوانبار لەماوەى سێ ساڵ لەژن خوازىيەكەوە بەبێ هۆيەكى پەسەند "تەلاق" ى دا، يان بەهۆى رەفتارى ناشيرينى پياوەكە لەيەك جيابوونەوە، ئەوا داواكارى گشتى (المدعىالعام)،

قوربانی‌یەکە، یـان ئەوکەسـەی بـەرژەوەندیی لەکێشـەکەدا هەیـە، ئەتوانێت داوای وەستان یـان دەسـت پێکردنـەوەی دادگایی‌یەکـە بکات.

بەندی (٣٩٩)

هەرکەسـێك مرۆڤێکـی لـە (١٨) سـاڵ منالـتر، هـەڵبنێت بـۆ بێئابڕوویی، یان ڕێی بۆئاسان بکات، یان بەمەبەستی (قازانج) یان (کرێ) هانی‌دا، ئەوا ماوەیەك بەند یان زینـدان ئەکرێت کەلە (١٠) ساڵ زیاتر نەبێت.

بەندی (٤٠٠)

ئەگەر یـەکێك ڕەفتـارێکی ناشیرین بەبێویسـتی بەرامبەرەکـەی بکات، ماوەیـەك بـەند ئەکرێت لە (ساڵێك) پتر نـەبێت یـان (١٠٠) دینار سزا ئەدرێت یان بە هەردووکیان سزا ئەدرێت.

بەندی (٤٠١)

ئەگەر یەکێك بەئاشکرا (لەبەرچاو) ڕەفتارێکی ناشـیرین بکـات ئەوا تاشەش مانگ بەند ئەکرێت یان (٥٠) دینـار سزا ئەدرێت یان بە هەردووکیان سزائەدرێت.

بەندی (٤٠٢)

١ـ تاسێ مانگ بەند ئەکرێت یان (٣٠) دینـار سزائەدرێت یـان بەهەردووکیان سزائەدرێت. هەرکەسێك:

أ ـ داوای ڕەفتارێکی ناشیرین لەنێرینە یان مێینە بکات.

ب ــ گـەر لەشـوێنێکی گشـتی‌داو بەوتــە یــان بەدەسـت بــۆ ڕاکێشان، ڕووبەڕووی مێینەیەك بووەوە، کەئابڕووی بڕۆشێنێت.

٢ـ ئەگەر تاوانکار لـەماوەی ساڵێکدا ئەمـەی دووبارە کـردەوە، ئـەوا تاشــەش مــانگ بــەند ئــەکرێت یــان (١٠٠) دینــار ســزا ئەدرێت[٢٠٥]

**کەی مێینە ئەپشکنرێت[٢٠٦]؟**

١ـ بەرێکەوت بریندار‌بوونی ئەندامە سێکسی‌یەکان، بەتایبەتی کەلەمناڵدا روونەدات.

٢ـ ئەگەر پاش شووکردن، هەڵگرتن، رەدووکەوتن، گوم بوون، یان فڕاندن گومان لەکچێنی‌یەکەی کرا

٣ـ لەتاوانە سێکسیەکاندا

٤ـ لەسکاڵای کێشەی ناپیاوی و ناژنێتی و وەجاخ کوێری‌دا

٥ـ گومان لەسك پڕی، لەبارچوون، مناڵ بوون یان لەسەر داوای باوك و دایك.

بۆئەوەی بتوانین مێینەکە بپشکنین، ئەبێ بەکورتی لەئەندامە سێکسی‌یە دەرەکی‌یەکان بدوێین، کەئەویش (کیلەك ـ الفرج)ـە و لەم بەشانە پێك هاتووە.

١ـ بەر (الرکب ـ Mons venercs): ناوچەیەکی سێگۆشەیە مووی بەری پێوەیە، بنکەی سێگۆشەکە لەسەرەوەیەو لوتکەکەی بەرەو خوارەوەیە.

٢ـ لچی گەورە (الشفرتان ـ labia majara): لەمێینەدا بەرامبەر تورەکەی گونی نێرینەیە. لەخواربەرەوە دەست پێ‌ئەکات تا ئەگاتە بەردەم کۆم. دوو رووی هەیە، رووی دەرەوە وەك پێست وایە، رەنگی تۆخترەو موویەکی لوولی لێ ئەروێت. دیوی ناوەوە نەرمەو تەڕەو دەردراوی خۆی هەیە. لەژێر ئەم رووپۆشەدا لچی گەورە لە چەوری‌یە شانەیەك پێ هاتووە، کەماسولکەی پێست، بۆری خوێن، دەمار و رژێنەری (بارثولین) ی تیایە.

٣ـ لچی گچکە (الاستکان ـlabia minorgo)

دوولۆچی بچوکی پێستە. بەبلاوکردنەوەی ناوگەڵ سێگۆشەیی دەرئەکەون. لەسەرەوە لەژێر قیتکەدا یەك ئەگرنەوە. موویان پێوەنی‌یە، چەوری‌یان کەمە، بۆری خوێنیان زۆرە، بەمە

ڕەنگیان پەمەیییەکی تۆخە. تۆڕەدەماری تیایە، وای لێ ئەکات زۆر هەستیار بێت. ڕژێنەرەکانی تەڕوشێداری ئەکەن.

٤- قیتکە (البظر - Clittoris)

زیادە گۆشتێکی بچکۆلەیە، بەرامبەر (چوك) ی نێرینەیە. بەڵام بچووکترە و تەنیا لە (تەنەبۆشە) پێکهاتووە و بۆری میزی پیاناڕوات.

٥- پەردەی کچێنی (غشا ء البکارة - Hymen)

ئەکەوێتە دەرکی (زێ - المهبل)ـەوە. لەدوو توێژ پێکهاتووە، بۆری خوێن و لیمف و دەمارەکانی ناویان رووپۆش کردووە. ئەم پەردەیە زۆر تەنکە وەك پەڕەی گوڵ، ئەشێت هەندێك جار ئەستور یان لاستیکی بێت و بەگرانی بدڕێت. بەپێی ژمارەو جۆری ئەو کونانەی کەتیایەتی (بۆهاتنە دەرەوەی خوێنی بێنوێژی مانگانە) ئەکرێت بە چەند جۆرێکەوە، بەپێی بڵاوی و زۆرییان، والە خوارەوە ریزیان ئەکەین.




ا - بازنەیی (الدائری - circular ): تەنیا کونێکی لەناوەڕاستدا تیایە، ئەم کونە پەنجە تووتەی پیائەچێت.

ب - ناڵی ئەسپ (نعل الفرس - horse shoe): کونێکی تیایە لەشێوەی (ناڵ) یان پیتی (ن) دایە.




ج — هەیڤی (الهلالی — cresent): کونەکەی لەشێوەی کەلەبەرێکدایە کەزۆربەی بەشی سەرەوەو ناوەراست ئەگرێتەوەو تەلیزمێك بەدیواری بن و لاکانییەوە ئەمێنێت، لەشێوەی مانگی یەك دوو شەوە (هەیڤی) دایە.

د ـ جووتە کوون (الجسری): دوکونی تیایەو بە بەربەستێك کوونەکان لەیەك جیاکراونەتەوە.




هـ ـ بێژنی (الغربالی ـ cribeiform): لەدووکون زیاتری تیایە .




و ـ بێکون (الرتق ـ imperforated): هیچ کونی تیانییە. پاش کەوتنە (بێنوێژی) وردە وردە خوێن لەمناڵدان و زێدا کۆئەبێتەوەو ئەبێتە هۆی گەورە بوون و دەرکەوتنی مناڵدان و بەهەڵە بە (سك) دائەنرێت.




لەکۆتاییدا ئەڵێن کەلێواری کونەکان ئەشێت لووس و رێك یان نارێك و گرنج گرنج بێت.

## چۆن مێینەکە بپشکنین؟

وەك پێشتر باس کرا، پزیشکی دادوەر بەیاوەری پەرستار (ممرضة) یێك لەژوورێکی تایبەتی‌دا، مێینەکە ئەپشکنێت. ئەبێت بەگشتی لەمێینەکە وردبێتەوە، نووسراوی پێناردنەکە بخوێنێتەوە. شێوازو هۆی پشکنینەکە لەنێردراوەکە بگەیەنین.

لەیەکێك لەم بارانەی خوارەوەدا مێینەکە ئەنێردرێت بۆ پشکنین[٢٠٨]:

١ـ سکاڵای بەزۆر سوار بوون.

٢ـ سکاڵای مێرد لەداوێن پیسی ژنەکەی.

ئەم دووپۆلەش یەکێك لەم تاوانانەی خوارەوە ئەیانگرێتەوە.

١- بەزۆر سواربوون:

ا - قوربانی‌یەکە کچە.

ب - قوربانی‌یەکە ژنە.

٢- داوێن پیسی:

ا - لەگەڵ کچ.

ب - لەگەڵ ژن.

جائەگەر:

ا - پیاکردن و (بن) پژاندن بێت.

ب - بێ‌پیاکردن بێت[٢٠٩]

ئەشێت قوربانی‌یەکە سکی پڕبێت یان نە ء، تووشی نەخۆشی سێکسی ببێت یان نە ء.

١- بەزۆرسوار بوون: چونکە زۆربازی تیایەو بەویستی مێینەکە نی‌یە، ئەبینین جل‌وبەرگەکەی ئەدرێت. لەوانەیە شوێن دەست و چرنوك بەدەم‌ولێوی‌یەوە ببینرێت، تاوانکار هەوڵی داوە دەم و لووتی بگرێت تا وای لێ بکات خۆی بدات بەدەستەوە و دەنگی کپ بکات. یان لەوانەیە رووشان و شین بوونەوەو خوێنرێژی لەسەر ران و بەشی خوارەوەی سك و ناوگەڵیدا ببینین، جگە لەوەی[٢١٠]:

ا - لەکچ دا: پەرەدەکە ئەدرێت و خوێنی لێ دێت. قەراغی دڕاوی‌یەکە بەئاشکرایی دیارە، ناوچەکە خوێناوی‌یەکە جگەلەوەی کەئەشێت ناوزێ و سەرکیلەکی قوربانی‌یەکە بەتۆواوی تاوانبارەکە تەڕبێت، مووی بەرولچی گەورە بە کاریگەری تۆواوەکە بەیەك دا ئەنووسێن و گرمۆڵە ئەبن.

ئەشێت هەموو ئەو نیشانانەی لەسەرەوە باس کران ببینرێت، بەڵام تاوانەکە نەگەیشتبێتە ئەوەی پەردەی کچێنی بدرێت، یان

جۆری پەردەکە لاستیکی بێت و نەدڕابێت. بەڵام لەم بارەدا، گەرچی پەردەکە ساغە بەڵام شین بوونەوەو خوێنڕێژی لەسەر ئەبینرێت.

ب ـ لەژن دا: ئەو نیشانانەی باسکران، هەموو یان هەندێکی ئەبینرێن. تەنیا جیاوازی ئەوەیە کە (پەردەی کچێنی) نییە تا دڕاوی و خوێنڕێژی ببینین. بەڵام لەوانەیە شین بوونەوەو خوێنڕێژی لەسەر دیواری (زێ ـ المهبل) دا ببینرێت[٢١١].

٢ـ داوێن پیسی:

أ ــ لەگەڵ کچ دا: لەبەرئەوەی بەویستی هەردوولایە، نیشانەی زۆربازی و برینداری نابینرێت، مەگەر نێرینەکە (سادیزم) بێت و لەدۆستەکەی بدات و برینداری بکات. تەنیا ئەوە ئەبینرێت، کەپەردەکە ئەدڕێت (ئەگەر پیابکرێت) ئەوا نیشانەکانی دڕانی پەردەی تیا ئەبینرێت و هەندێك درزو قڵیش‌و رووشان لەدەمی کیلەك دا ئەبینرێت. جگە لەوەی (ئەگەر رشتبێتی) ئەشێت تۆواو لەسەر کیلەك یان لەناو (زێ)دا ببینرێت. ئەشێت کارەکە تەنیا (لێخە ـ بێ‌پیاکردن) بێت، لەم کاتەدا هیچ نیشانەو برینداری‌و دڕاوی‌یەك نابینرێت، مەگەر بەوردی باش بەزەرەبین سەیر بکرێت تا هەندێك رووشان یان تۆواو لەسەر کیلەك ببینرێت.

ئەشێت تەنیا بە (لێخە) مێینەکە (ئاوس) بێت یان تووشی نەخۆشی سێکسی ببێت.

ب ـ لەژن دا:

نیشانەکانی وەك ئەوەیە لەکچدا باسکرا، ئەگەر (پیاکرا)، ئەوا هیچ نیشانەیەکی دڕاندنی پەردەی کچێنی (کەنەیماوە) نابینرێت. هەر ئەوەندەیە، بەدۆزینەوەی مووی نێرینە یان تۆواو ئەتوانرێت روودانی تاوانەکە بسەلمێنرێت.

پزیشك چیبكات، كەبۆ ئەم پشكنینە بانگ كرا

١ـــ ئـــەبێت دڵنیـــا بێـــت كـــە نێردراوەكـــە خـــاوەن وێنـــەی سەرنووسراوی ناردنەكەیـە و مەچـەكی مۆركـراوەو نووسـراوەكە ڕێك و پێكە.

٢ـــ شـــوێنی پشـــكنین و یـــاوەر (پەرســـتار) ەكـــەی و پێویستییەكانی پشكنین ئامادەیە.

٣ـ ئەبێت لەشێوەی گشتی و جلو بەرگ و ئارایشت و تەمەن و بـاری دەروونـی تاوانبـاران وردبێتـەوە. بـەدوای ئـەو نیشـانە گشتییانەیِ دڕانی جلو بەرگ و برینداری لەش دا بگەڕێت.

٤ـ چۆنییەتی و هۆی پشكنینەكە لەنێردراوەكە بگەیەنێت.

٥ـ مێینەكە لەسـەر پشـت پاڵ ئەكـەوێت، ئـەژنۆو جومگـەی سێبەندەی ئەنوشتێتەوە و هەردوولاقی بڵاوئەكاتەوە.

٦ـــ تـێبینی بـەرو كیلـەك ئـەكرێت، بـەدوای مـووی بێگانـە، پاشماوەی تۆواو، رووشان، برینداری و خوێندا... هتد ئەگەڕێت.

٧ـ تێبینی پەردەی كچێنی بكات (لەكچدا) لەدیوارەكانی (زێ) وردبێتـەوە لـەژندا. ئەمەش بـۆ دۆزینـەوەی دڕان، رووشـان، شـین بوونەوە، خوێنڕێژی، تۆواو، مووی بێگانە.

٨ـ سڕین (مسحە) لەناوزێو دەری زێ وەربگیرێت

٩ـ جلوبەرگی ژێـرەوە لەگـەڵ نووسـین و سلایدی سڕینەكاندا ئەنێردرێت بۆ پشكنین.

١٠ـــ پـاش تـەواوكردنی خاڵـەكانی سـەرەوە، راپۆرتەكـە ئەنووسرێت. هەندێك جار، تاوانبارە نێرینەكەش ئەنێردرێت بۆ پشكنین.

**پزیشك چی بكات؟**[٢١٢]

١ـ ئەبێت دڵنیا بێت، كە گومانلێكراو بەنووسراوێكی تەواو نێردراوە. خاوەن وێنەی سەر نووسراوەكە خۆیەتی و مەچەكی مۆركراوە.

٢ـ كورتەیەك لەچیرۆكی تاوانەكە، وەرگرێت.

٣ـ لەسەر جلو بەرگەكانی بەدوای پەڵەدا بگەڕێت.

٤ـ تێبینی بەژن و بالاو تەمەنی نێرینەكە بكات. بەدوای ئەو برینداری‌یانەدا بگەڕێت وەك جێ‌چرنوك لەسەر دەمو چاووشان‌و مل كەئەشێت لەكاتی تاوانەكەدا، تاوانكار بریندار بووبێت..

٥ـ سەیری قەبارەی (چوك ـ القضيب ـ Penis) بكات. هەوڵ بدات بیسەلمێنیت كە نێرینەكە (پیاوە ـ توانای سێكسی هەیە) یان نە ء. تێبینی برینداری‌و رووشاوی (چوك) بكات. بەتایبەتی ژێر پۆپەكەی. بەدوای نیشانەی نەخۆشی‌یە سێكسی‌یەكان دا بگەڕێت.

٦ـ نموونەی مووی بەرو خوێن وەربگیرێت بۆ پشكنین و گروپی خوێن. جگە لەوەی (سڕین) لەبۆری میزو دەری بۆری‌یەكە وەئەگیرێت و دەرپێكەی لەگەڵ ئەم شتانەدا ئەنێردرێت بۆ پشكنین لەپزیشكی‌ی دادوەری.

لەكۆتایی‌دا پزیشك راپۆرتەكە ئەنووسێت.

ئەبێت ئەوەشمان لەبیر نەچێت، مەرج نی‌یە هەموو نێردراوێك ئەم شتانەی تیا بدۆزرێتەوە، هەندێك لەم سكالاو نێردراوانە تەنیا گومان لێ كراون و هیچ تاوانێكیان نەكردووە. بۆیە چەند وردبین لەم پشكنینانەدا هەر كەمە.

* * *

سك پڕی:

سەلماندنی سك پڕی لەم بارانەی خوارەوەدا گرنگە:

١ـ مێینەکە سکالای ئەوە ئەکات، لەئەنجامی تاوانێکی سێکسی، سکی پڕ بووە. ئەگەر سەلما کە سکی هەیە، ئەوا کێشەکە تاپاش منالبوون دوا ئەخرێت. کە منالەکەی بوو پزیشك بەپێی جۆری خوێن منال و دایك و گومانلێکراوەکە، بیروڕای خۆی دەرئەبڕێت.

٢ـ ئەگەر مێینەکە سزای خنکاندن درا. ﴿بەپێی بەندی (٢٨٧)ی یاسای بنەماکانی دادگای سزادان ـ قانون اصول المحاکمات الجزائیە﴾[٢١٣] دەرکەوت کە سکی هەیە، ئەوا تاپاش منالبوون، خنکاندنەکە دوا ئەخرێت .

٣ـ سکالای ژنێکی (تەلاق دراو) کەلەمێردە کۆنەکەی سکی هەیە، تابتوانێت خەرجی لێ بسێنێت.

٤ـ سکالای بێوەژن، کەلە مێردە مردووەکەی سکی هەیە، تامیراتی منالەکەی وەربگرێت.

٥ـ سك پڕی نیشانەیەکی بەلگە نەویستی تاوانە سێکسییەکانە.

٦ـ سك پڕی، کاتی ڕوودانی تاوانە سێکسییەکەمان بۆ دەرئەخات[٢١٤]

کەمێینە ئاوس بوو (سکیهەبوو)، بێنوێژ نابێت، بێزوو ئەکات، سکی بەرز ئەبێتەوە، مەمکی گەورە ئەبێت، ئەگەر بگوشرێت ژەکی لێدێت. دەوری گۆی مەمك تۆخ ئەبێت. منالدانی گەورەتر ئەبێت و دەردراوی منالدانی زۆر ئەبێت. بەلام تاپاش مانگی سێی سك پڕی، تەنیا ئەتوانین پشت بەپشکنینی سك پڕی (فحص الحمل ـ Pregnancy test) ببەستین. ئەمەش لەسەر

میزی سك پڕەکە ئەکرێ و لەدوو هەفتەی دوای سك پڕی یەوە تادوو هەفتە پاش منالّ بوون هەر (پۆزەتیف ـ إیجابی) ئەبێت.

پاش سێ مانگی سك پڕی:

١ـ پارچەکانی لەشی کۆرپەلە بەردەست ئەکەوێت.

٢ـ لێدانی دڵی کۆرپەلە ئەبیسترێت.

٣ـ بەئێکسبەرداری، پەیکەری ئێسکی کۆرپەلە دەرئەکەوێت.

**لەبار چوون:**

بریتی یە لەدانانی کۆرپەلەو ویڵاش پێش حەوت مانگی و ئەم جۆرانەی هەیە.

- بەرێکەوت لەبارچوون _ (الاجهاض الحادثی)
- لەباربردن ( الاجهاض محرض)
- لەبارچوونی تەواو (( الاجهاض التام)
- تاوانە لەباربردن (( الاجهاض الجنائی)
- خووەلەبار چوون (إلاجهاض المتكرر)
- خەریکە لەباربچێت (إلاجهاض الوشیك)
- هەرلەبار ئەچێت (إلاجهاض الحتمی)
- لەبارچوونی بەسەرچوو (إلاجهاض الفائت)
- لەخۆوە لەبارچوون (إلاجهاض العفوی)
- هەرەشەی لەبارچوون (إلاجهاض المهدد)

ئەوەی لای ئێمە گرنگە دووجۆر لەبارچوونە[٢١٥]

١ـ لەبارچواندنی چارەیی (الاجهاض العلاجی)

٢ـ تاوانە لەباربردن (الاجهاض الجنائی)

**تاوانە لەباربردن**

ئەمەش چەند هۆیەکی هەیە وەك:

١ـ پیاکێشانی سك: بەرێکەوت یان بەمەبەست، سك پڕێك لەبارئەبات. لەم کاتەدا نیشانەی زەبر لەسەر سك ئەبینرێت.

٢ـ لەباربردن: بۆشاردنەوەی بەرهەمی تاوانە سێکسی‌یەکان، ئەمیش لەلایەن پزیشك، پەرستار، برین پێچ، یان مامانێکەوە بەیەکێك لەم ڕێگانەی خوارەوە ئەکرێت:

أ ـ دەرزی و دەرمان[٢١٦]

ب ـ شلەکردنە ناو منداڵدان

ج ـ فراوانکردنی ملی منداڵدان (بەئامێر)

ئەشێت بەیەکێك لەم ڕێگایانە منداڵەکە لەباربرێت و دایکەکە بێ مەلامەت دەرچێت. ئەشێت دایکەکە بەهۆی سووتانەوەی منداڵدان، خوێنڕێژی منداڵدان یان دەمەوانەی هەوایی یان تەقینی منداڵدانەوە بمرێت. لەلاشە توێکاری‌دا، پاش کردنەوەی سك، منداڵدان ئەپشکنرێت، بۆ دۆزینەوەی نیشانەکانی سووتانەوە، خوێنڕێژی، یان تەقینی منداڵدان. ئەگەر هیچیان نەدۆزی‌یەوە، دڵ و خوێنبەری سی‌یەکان ئەپشکنین بۆدۆزینەوەی (دەمەوانەی هەوایی).

تەقینی منداڵدان پاش لەبارچواندن چەند نیشانەیەکی هەیە، لەڕێکەوتە تەقینی منداڵدانی جیا ئەکاتەوە، وەك لەم خشتەیەی خوارەوەدا ئەیان خەینەڕوو[٢١٧]

| زنجیره | جووداگانه | بەرێکەوت تەقین | تاوانەتەقاندنی مناڵ دان (تەقینی پاش لەبارچواندن) |
|---|---|---|---|
| ١ | کاتی روودان | پاش مناڵبوونێکی گران، لەمانگەکانی دوادوایی سکپڕی | لەهەرکاتێکی سکپڕیدا |
| ٢ | شوێنی تەقینەکە | برینەکەئاسۆیی یەولەبەشی خوارەوەی مناڵداندایە | چەند درین و پیاکردنەبرین لەملی مناڵدان، ناو مناڵدان یان پاشەوەی(زێ)دایە |
| ٣ | ئاوسان وسووربوونەوەی زێ ولچە گەورەکان | ئەبینرێت | نابینرێت |
| ٤ | تەنی بێگانەوماددەی کیمیکی لەزێ یان ملی مناڵدان دا. | نابینرێت | ئەبینرێت |
| ٥ | بەشێک یان ئامێرێک لەوانەی بۆلەباربردن بەکاردێت لەکیلەک دا. | نابینرێت | ئەبینرێت |
| ٦ | لاوازیوشیبوونەوەوتەنک بوونەوەی ماسولکەی مناڵدان. | ئەبینرێت | نابینرێت |
| ٧ | رووشان،شین بوونەوەی دەرو ناوکیلەک. | نابینرێت | ئەبینرێت |

# پەراوێزەکان

١- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٩ )
٢- سەرچاوەی ژمارە (١)
لاپەڕە ( ١٢ )
٣- سەرچاوەی ژمارە (٧)
لاپەڕە ( ١٠١ )
٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ١٠٣ )
٥- سەرچاوەی ژمارە ( ١ )
لاپەڕە ( ٦ )
٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە (٢٧٥ )
٧- سەرچاوەی ژمارە ( ١ )
لاپەڕە ( ٨ )
٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٢٧٧ )
٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ١ )
١٠- سەرچاوەی ژمارە ( ١ )
لاپەڕە ( ٨ )
١١- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ٩٦ )
١٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٢٨٠ )
١٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٢٧٩ )
١٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٢٨١ )
١٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٥ )
لاپەڕە ( ١ )
١٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ٩٦ )
١٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ٩٦ )
١٨- سەرچاوەی ژمارە ( ١ )
لاپەڕە ( ٨ - ٢٠ )
١٩- سەرچاوەی ژمارە ( ١ )
لاپەڕە ( ١٠ )
٢٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٢٨٣ )
٢١- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٢٨٤ )
٢٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ٩٦ )

٢٣- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ٤ )
٢٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٥ )
٢٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٨ )
٢٦- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ١١ )
٢٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ٩٧ )
٢٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ٢٨٧ )
٢٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٦ )
٣٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ٩٧ )
٣١- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ٩٧ )
٣٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ٢٨٩ )
٣٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ١٠ )
٣٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ٢٨١ )
٣٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ١١ )
٣٦- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ٩ )
٣٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ٩٧ )
٣٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ١١ )
٣٩- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ٩ )
٤٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ٩٨ )
٤١- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ٢٩٣ )
٤٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ١١ )
٤٣- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ١٣ )
٤٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ١٢ )
٤٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ٢٩٣ )
٤٦- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ١٣ )
٤٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ١٤ )
٤٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ٩٩ )

٤٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٥ )
لاپەڕە ( ١٥ )

٥٠- سەرچاوەی ژمارە ( ١ )
لاپەڕە ( ١٣ )

٥١- سەرچاوەی ژمارە ( ٥ )
لاپەڕە ( ١٦ )

٥٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٣٠٠ )

٥٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ٩٩ )

٥٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٥ )
لاپەڕە ( ١٧ )

٥٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ٩٩ )

٥٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٩ )
لاپەڕە ( ١ )

٥٧- سەرچاوەی ژمارە ( ١ )
لاپەڕە ( ٣٦ )

٥٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٣١ )

٥٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٨ )
لاپەڕە ( ٥ )

٦٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٩ )
لاپەڕە ( ٥ )

٦١- سەرچاوەی ژمارە ( ٨ )
لاپەڕە ( ١٩ )

٦٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٩ )
لاپەڕە ( ٩ )

٦٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٧٥ - ٧٦ )

٦٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٨ )
لاپەڕە ( ٥٧ )

٦٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٧٨ )

٦٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ١١٦ )

٦٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ١١٣ )

٦٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٥ )
لاپەڕە ( ٥١ )

٦٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٩ )
لاپەڕە ( ٧ )

٧٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٩ )
لاپەڕە ( ١١ )

٧١- سەرچاوەی ژمارە ( ٧ )
لاپەڕە ( ١١٣ )

٧٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٢ )
لاپەڕە ( ٣٨ )

٧٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٥ )
لاپەڕە ( ٥٠ )

٧٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٩ )
لاپەڕە ( ٥٧ )

٧٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٨)
لاپەرە ( ٦٠ )
٧٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٥٤ )
٧٧- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ٤٠ )
٧٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١١٢ )
٧٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٨)
لاپەرە ( ٦١ )
٨٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٩)
لاپەرە ( ٧٤ )
٨١- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٥٤ )
٨٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ٤١ )
٨٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٥٥ )
٨٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٣)
لاپەرە ( ١٩ )
٨٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١١٢ )
٨٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ٤٢ )
٨٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٩)
لاپەرە ( ٥٦ )

٨٨- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ٤٢ )
٨٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٩)
لاپەرە ( ٧ )
٩٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٧٩)
لاپەرە ( ١١٤ )
٩١- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ٤٦ )
٩٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٨)
لاپەرە ( ٥٦ )
٩٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٥٧ )
٩٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٩)
لاپەرە ( ١٧ )
٩٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١١٥ )
٩٦- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ٤٦ )
٩٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١١٥ )
٩٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٦١ )
٩٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٥٩ )
١٠٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٦٢ )

١٠١- سەرچاوەی ژمارە ( ٨)
لاپەڕە ( ١٧١ )
١٠٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٩)
لاپەڕە ( ٥ )
١٠٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٥٥ )
١٠٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٩)
لاپەڕە ( ١٠ )
١٠٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٦٧ )
١٠٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٥٠ )
١٠٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٦٢ )
١٠٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ١٢٥ )
١٠٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ١٢٤ )
١١٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٩)
لاپەڕە ( ١٢ )
١١١- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٧٢ )
١١٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٩)
لاپەڕە ( ١٢ )
١١٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٧٢ )
١١٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٧١ )
١١٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ١٢٤ )
١١٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ١٢٨ )
١١٧- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەڕە ( ٦١ )
١١٨- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەڕە ( ٦١ )
١١٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٧٦ )
١٢٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ١٢٨ )
١٢١- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەڕە ( ٦٨ )
١٢٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ١٢٨ )
١٢٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٧٥ )
١٢٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٧٦ )
١٢٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ١٢٩ )
١٢٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٧٧ )

١٢٨ـ سەرچاوەی ژمارە( ٩٩)
لاپەرە ( ١٦ )
١٢٩ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٢٩ )
١٣٠ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ٧٩ )
١٣١ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٣١ )
١٣٢ـ سەرچاوەی‌ژمارە(٥)
لاپەرە ( ١٠٦ )
١٣٣ـ سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەرە ( ٩٥ )
١٣٤ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ٨٣ )
١٣٥ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ١١٠ )
١٣٦ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٩)
لاپەرە ( ٢١٢ )
١٣٧ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٥٠ )
١٣٨ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٩)
لاپەرە ( ١٣٠ )
١٣٩ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٤٩ )
١٤٠ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ١٥١ )

١٤١ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ١٥٦ )
١٤٢ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ١٥٦ )
١٤٣ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٥١ )
١٤٤ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٥١ )
١٤٥ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ١٣٥ )
١٤٦ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ١٦٣ )
١٤٧ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٥٦ )
١٤٨ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ١٦٥ )
١٤ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٥٦ )
١٥٠ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٥٨ )
١٥١ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەرە ( ١٦٧ )
١٥٢ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٦٠ )
١٥٣ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەرە ( ١٣٨ )

١٥٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ١٦٨ )
١٥٥- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەڕە ( ١٢٥ )
١٥٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٨٧ )
١٥٧- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەڕە ( ١٢٨ )
١٥٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٩٥ )
١٥٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ١٩٧ )
١٦٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ١٠٦ )
١٦١- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ١٣٨ )
١٦٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ١٩٧ )
١٦٣- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەڕە ( ١٣٠ )
١٦٤- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەڕە ( ١٤٧ )
١٦٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٩٥ )
١٦٦- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەڕە ( ١٥٠ )
١٦٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٩٥ )
١٦٨- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەڕە ( ١٥١ )
١٦٩- سەرچاوەی ژمارە ( ١)
لاپەڕە ( ١٥٤ )
١٧٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٩٧ )
١٧١- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٩٥ )
١٧٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٩٦ )
١٧٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ١٨٦ )
١٧٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٩٤ )
١٧٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢١٧ )
١٧٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢٢٠ )
١٧٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢٢٧ )
١٧٨- سەرچاوەی ژمارە (١٠)
لاپەڕە ( ١٦ )
١٧٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ١٦٧ )

١٨٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢٣٥ )
١٨١- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ١٧٧ )
١٨٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢٣٨ )
١٨٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ١٧٠ )
١٨٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ١٦٣ )
١٨٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ١٦٣ )
١٨٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ١٧٠-١٧١ )
١٨٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ١٧٢ )
١٨٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ١٧٥ )
١٨٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢٣٤ )
١٩٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢٤٩ )
١٩١- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ١١٠ )
١٩٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢١ )
١٩٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٤٢ )
١٩٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٢٦ )
١٩٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٤٣ )
١٩٦- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢١ )
١٩٧- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢٤ )
١٩٨- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٢٠٠ )
١٩٩- سەرچاوەی ژمارە ( ٣)
لاپەڕە ( ٣١٩ )
٢٠٠- سەرچاوەی ژمارە ( ٥)
لاپەڕە ( ٢٠١-٢٠٣-س-٢٢١لا٣٢١ )
٢٠١- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢٤ )
٢٠٢- سەرچاوەی ژمارە ( ٢)
لاپەڕە ( ٢٣ )
٢٠٣- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ٩١ )
٢٠٤- سەرچاوەی ژمارە ( ٣)
لاپەڕە ( ١٣ )
٢٠٥- سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەڕە ( ٨٥-٨٨ )

٢٠٦ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٣)
لاپەرە ( ٢٥ )

٢٠٧ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٣)
لاپەرە ( ٣٩-٤٥ )

٢٠٨ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ٨٥ )

٢٠٩ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٣)
لاپەرە ( ٣٥ )

٢١٠ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٣)
لاپەرە ( ٣٦ )

٢١١ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ٩٣ )

٢١٢ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٣)
لاپەرە ( ٧٢ )

٢١٣ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٣)
لاپەرە ( ٧٣ )

٢١٤ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ١٦٥-٤٤ )

٢١٥ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٧)
لاپەرە ( ٤٤ )

٢١٦ـ سەرچاوەی ژمارە ( ٣)
لاپەرە ( ٩٥ )

## [illegible]


١ـ الطب العدلي التطبيقي (د.لويس شمعان ـ مطبعة الارشاد ـ بغداد ١٩٧١)

٢ـ الطب القضائيوأداب المهنةالطبية (د.ضياءنوريحسن ـ موصل ـ جامعة الموصل ١٩٨٦)

٣ـ الطب العدلي (علماً وتطبيقاً ـ د.وصفي محمدعلي ـ بغداد ١٩٧٧)

٤ـ أطلس الطب العدلي (د.عبدالوهاب الجلبي ـ موصل ـ جامعة الموصل ١٩٧٩)

5-Foresic Medicane 9th editio Keith Simpson CBE London 1985

6- Book of Poisoning Robert H California 1987 Hand

7-Lecture Notes on Forenis Medicine 2th edition D.J. Gee London 1975

8-Schwartz, Shires, Principlen of surgery 6th edition 1993

9-short Practice of surgery 20th edition Bailey& Love's

١٠ـ تعليمات الطبية عدلية (وزارة الصحة ـ دارالحرية للطباعة والنشر ١٩٧٣

# فەرهەنگۆك

## أ

الاعدام: هەڵواسین

التهاب السحايا: مێشكە پەردەسۆ

الاحصاء: ئامار

الام القاسية: تورتە پەردە

الام الحنونە: نەرمە پەردە

الارادیی: خۆویست

أربطه الفاصل: جومگە بەند

اجسام غریبە: تەنی بێگانە

ارزقات: شین بوونەوە

إختناق: خنكان

الانعكاس البؤبؤی: فرتە دەماری بیبیلە

الانعكاس القرنی: فرتە دەماری پەرگلێنە

اجری اللازم: چی پێویست بوو كرا

إتجاه الاطلاقة: ئاڕاستەی تەقە

الانضمام الهوائی: دەمەوانەی هەوایی

الانضمام الشخصی: چەوری‌یە دەمەوانە

الاحلیل: میزەجۆ

الاعصاب القحفیە: كەللەدەمار

الاطلاقة: فیشەك

الاخلاق: رەوشت

الاستكان: لچەبچووكەكان

اشلاء الجثة: پارچە لاشە

الافیون: بەنگ

الانعاش: ژیاندنەوە

إغتصاب: بەزۆر سواربوون

الاجهاض الجنائی: تاوانە سواربوون

الاجهاض المتكرر: خووە لەبارچوون

الاجهاض الوشیك: خەریكە لەباریچێ

الاجهاض الحتمی: هەر لە بارئەچێ

الاجهاض الفائت: لەبارچوونی بەسەرچوو

الاجهاض العفوی: لەخۆوە لەبارچوون

الاجهاض المهدد: هەرەشەی لەبارچوون

## ب

البظر: قیتکه

البقع الرمیه: خوێن نیشتن

البریتون: هەناوەپۆش

البارود: باروت

## ت

توقف القلب المفاجئ: کتوپڕ وەستانی دڵ

تخطیط القلب: نەواری دڵ

تخطیط الدماغ: نەواری مێشك

التشنج الموتی: کرژبوونی مەرگی

تبرد الجسم: ساردبوونەوەی لەش

تعجیل الارض: تاودانی زەوی

التسمم: ژەهراوی بوون

تسمم الدم: پیس بوونی خوێن

التحلیل الذاتی: خۆشیتەڵ کردنەوە

التحنیط: بەمۆمیابوون

التصبین: بوون بەسابوون

التفاعل الحیوی: زیندەکار

التعویض: خستنەبری

التجمع الدموی: خوێنە گمۆڵ

تشریح الجثة: لاشە توێکاری

التجویف التخریبی: بۆشایی کاتی

التقریر الطبی الاولی: راپۆرتی سەرەتایی پزشکیی‌دادوەری

## ج

الجثة: لاشە

الجسری: جووتە کون

الجلطة القلبیة: لێدانی دڵی

جهاز دوران الدم: کۆئەندامی‌سووڕی خوێن

الجمجمه: کەللەسەر

جهاز العصبی: کۆئەندامی دەمار

جهاز التنفس: کۆئەندامی هەناسە

جروح السحایا: برینداییەکانی پەردەی مێشك

جروح الفروه: برینی پێستەسەر

الجرح البسیط: برینی ساکار

الجروح الخطرة: برینە ترسناکەکان

الجروح القاتله: برینە کوشندەکان

الجرح القطعی: براوەبرین

الجرح الطعنی: پیاکردنە برین

الجرح الوخزي: ئاژنه برين

الجروح الترددیه: برینه دودڵی‌یەکان

الجروح الطلقات النارية والشطايا: برینی گوللەو پارچه تەقەمەنی‌یەکان

## ح

حَب: خەپلە

حديثو الموت: تازه مردوو

حركات النزع: لنگه فرتێ

حيوي: کاریگەر

حيامن: تۆوی پیاو

الحياة المعلقة: گەندەمەرگ

حافظ الانسجة: شانەپارێز

الحلقة الرضية: بازنەی کوتران

حرق بارودي: سوتانی بارووتی

الحساسيه: فرەهەستیاری

الحوض: ئەستیلك

حديثوالولادة: نەوزاد، تازەبوو

الحنجره: گەروو

الخطورة: ترسناکی، مەترسی

## د

الدعاميه: بەرکەوتە

الدائري: بازنەیی

## ذ

ذات الرئة: سی‌یەسۆ

## ر

الرضة: کوتران

الرصاص: گولله

الركب: بەر

الرتف: بێکوون

## ز

الزنا: داوێن پیس

## س

السحبه: روشان

السائل: شله

السائل المنوي: تۆواو

السائل الشوكي: شلەی پەتکی مێشکی

ساق الدماخ: لاسکی مێشك

السبب الحقيقي للوفاه: هۆی راستەقینەی مردن

السماعة الطبية: بيستەری پزیشکی

السبطانة: لوولەی چەك

## ش

الشرج: کۆم

الشفرتان: لچە گەورەکان

الشدة: زەبر

الشدة علي الجمجمة: زەبری سەر

شدفة: پارچە پارچە بوون

شهادة الوفاة: مەرگنامە

الشبكية: تۆرە

## ص

الصدمة العصبية: لێدانی دەماری

الصدمه الكلوميه: لێدانی سیرەمی

الصمل الموتى: رەق بوونی مەرگی

الصرع: پەرکەم، فێ

الصاعقة: هەورە بروسکە

## ض

ضربة الشمس: خۆربردن

## ط

طلقة: گوللە

الطلقة النافذة: گوللەی کوناوەر

الطبلة: دۆسیە

طلب التشريح: داوای توێکاری

الطب العدلي: پزیشکیی دادوەری

## ظ

ظاهرة: دیاردە

الظرف: قاوغ

## ع

العظلات الملمساء: لووسە ماسوولکە

العاهات: کەموکوڕی

العطل: پەك کەوتن

العجز: پەك کەوتن

عظم الحوض: سێبەندە

عظم القصي: کۆڵەی سنگ

عظم العانة: ئێسکی بەرمووسەڵان

عيار: نمرە

العصب التائه: وێڵە دەمار

العنكبوتيه: پەردەی تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی

العدسه: هاوێنه

علامات الموت: نیشانەکانی مەرگ

العلامات الفارقة: نیشانه جیاکەرەوەکان

## غ

الغربالی: بێژەنگی

غشاء البکارة: پەردەی کچێنی

## ف

الفرج: کیلەك

الفعل مخل بالحیاء: رەفتاری ناشرین

الفقرات: بڕبڕەکان

فتحه الخول: کوونی دەرچوون

الفحوصات مختبریه: پشکنینه تاقیگای‌یەکان

فحص: ئەزمایش

فحص الحمل: ئەزمایشی سك پڕی

فتح القبر: هەڵدانەوەی گۆڕ

## ق

القضیب: چووك

قشره الدماغ: توێکڵی مێشك

قانون اصول المحاکمات الجزائیه: یاسای بنەماکانی دادگایی سزادان

## ك

الکدمه: شین بوونەوه

الکبسوله: کەپسولی فیشەك

الکسرالخطي: هێڵەشکاوی

الکسر المنخفظ: داچووه شکاوی

الکسر المنفتت: پارچەپارچه شکاوی

الکسر المرکب: شکاوی ئاوێته

کلم الولاده: زەبری زاین

## ل

لوح الکتف: دەفەی شان

اللواط: هەتیوباز

اللواطة: پاشەسواری

